# دیموکراسی دینه

(ومن يبتغ غير الإسلام ديناً فلن يقبل منه)

[ هەرکەسێك دوای دینێك بکەوێت جگە لە دینی ئیسلام ئەوە هەرگیز لێی وەرناگیرێت]


**دانانی شێخ:**

**باوکی موحەممەد عاصیمی مەقدیسی**

**وەرگێڕانی:**

**ئەنەس عبدالله**



**ربيع الأول-١٤٣١ك / شباط-٢٠١٠ز**

# پێشەكی وەرگێڕ

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان...

سوپاسو ستایشی بێ سنوور بۆ خوای پەروەردگارمان، وە درروودو سەلام بۆ پێغەمبەری پێشەوامان محمد ﷺ.

خوشك و برای موسوڵمان كاری گشت پێغەمبەران بریتی بووە لە بانگ كردنی خەڵكی بۆ بەندایەتی كردن تەنها بۆ خوای گەورەو خۆدوور خستنەوە لە طاغوت بەهەموو جۆرەكانیەوە، وە بێ گومان خوای گەورە ڕازی نیە بە هاوبەشی دانان و بێ باوەڕی كردن پێی.

جا وەك پێویستەكی شەرعی لەسەر شانم بەرامبەر بە موسوڵمانان بۆ پاراستنیان لە هاوبەشی دانان و ناساندنیان و هۆشیار كردنەوەو ئاگادار كردنەوەیان لە بەرنامەو دەستەواژە شیركیە نوێكان و نادیاركان كەلە نێو كۆمەڵگەی موسوڵماناندا سەری هەڵداوە، هەڵسام بە وەرگێڕانی پەرتووكی "الديمقراطية دين" بۆ سەر زمانی شیرینی كوردی كە لە نووسینەكانی شێخ "أبو محمد المقدسي"یە، وە لە وەرگێڕانیدا پشتم بەستووە بەو پەڕاوەی كەلە پێگەی ئەلیكترۆنی (www.almaqdese.net) بڵاوكراوەتەوە، خوای گەورە پاداشتی چاكەی بداتەوە.

تكام وایە لە خوێنەری بەڕێز كەبە هەستێكی موسوڵمانانە و بێ لایەنانە و بەرپرسانە ئەم پەرتوكە بیخوێننەوە بەبێ دەمارگیری بۆ هیچ كەس و لایەنێك، تەنیا مەبەست بریتی بێت لە دۆزینەوی حەق و ڕاستی، چونكە ڕوون و ئاشكرایە كە یەكێك لە بنچینەكانی ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە كەلە دوای پێغەمبەر ﷺ لە هیچ كەسێك هەموو قسەیەك وەرناگیرێ، بەڵكو ئەوەی گونجاو بێت لەگەڵ قورئان و فەرموودە دروستەكان وەری دەگرن و ئەوەی تریش ڕەت دەكەنەوە.

خۆشەویستان سەرەڕای وەرگێڕانی دەقی پەرتوكەكە بە پێویست زانی كە چەند ماددەیەك لە (ڕەشنوسی دەستووری عێراقی) و (پڕۆژەی دەستوری هەرێمی كوردستان- عێراق) لە شوێنی گونجاودا زیاد بكەم و بیخەمە نێو دوو كەوانەی بەم شێوە [ ]، ئەمەش بۆ

ئەوەی کەسێك گومانی وا نەبات کە ڕەشنووسی دەستووری عێراقی یا پڕۆژە دەستووری هەرێمی کوردستانی عێراق لەگەڵ دەستووری ئوردنی یان کوێتی یان میصری جیاوازەو ئیسلامیەو جێگەی ڕەخنە لێ گرتن نیە!! وە تاوەکو کەمێك ئاشنا بن بە کەمێك لەو ماددە دەستووریانەی کەلە وڵاتەکەمان پیادە دەکرێت و پێچەوانەن لەگەڵ ناوەڕۆك و حەقیقەتی ئاینی ئیسلام.

وەهەروەها مانای ئایەت و فەرموودەکانیشم لە نێوان هەردوو کەوانەی [ ] داناوە.

وە لەسەرەتاکەیشیدا کورتەیەك لە ژیاننامەی شێخ (أبو محمد المقدسي)م نوسیوە بۆ زیاتر ناسینی و ئاشنا بوونی.

لەکۆتاییدا لە خوای گەورەو بەزەیی داواکارم ئەم کارەم لێ قەبول بکات و بیکاتە هۆکارێك بۆ ڕێنمویی کردنی موسوڵمانان لە خراپیەکانی دیموکراسی.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته...

وەرگێڕ:

ئەنەس عبدالله

ربيع الأول-١٤٣١ك / شباط-٢٠١٠ز

# کورتەیەك لە ژیاننامەی دانەر*

باوکی موحەممەدی ناوی تەواوی (عاصیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی طاهیر)ە، لە ساڵی ١٣٧٨ك بەرامبەر ١٩٥٩ز لە گوندی (بەرقا) لە نابلس لە فەلەستین لەدایك بووە، ناسراوە بە (ئەبو موحەممەدی مەقدیسی).

دوای لە دایك بوونی بە سێ چوار ساڵ لەگەڵ خێزانەکەیان (فەلەستین)یان جێهێشتووەو چونەتە (کوێت)، لەوێ ماوەتەوە تاوەکو خوێندنی دواناوەندی تەواو کردووە، پاشان زانستی لە (زانکۆی موصل) خوێندووە لەسەر وویستی باوکی، بەڵام ئاواتی خۆی بریتی بوو لە خوێندنی ئیسلامی لە مەدینەی شاری پێغەمبەر ﷺ، بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندی کردووە بە چەند زانایەکی ئەم وڵاتە، لە کۆتاییدا زانای پایە بەرز (ئیبن باز) برقیەکی بۆ دەنێرێ، کە تیایدا پەیمانی پێدەدات کە لە زانکۆ وەربگیرێت، ئیتر دوای خوێندنی لە (زانکۆی موصل) بۆ ماوەی سێ ساڵ عێراق بەجێدەهێڵێت و سەفەر دەکات بەرەو (مەدینە). لەوێ بە ووردی پەرتووکەکانی کەڵە زانای ئیسلام ( ئیبن تەیمیە) و قوتابیەکەی (ئیبن قەیمی جەوزی) خوێندۆتەوە، وە هەروەها پەرتوکەکانی شێخ (موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب) و کوڕەکانی و نەوەکانی لە زاناکان خوێندۆتەوە.

دوای چەند جارێك چوونی بۆ پاکستان و ئەفغانستان لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٩٩٢ز لە ئوردن نیشتەجێ بووە، لەوێشدا بە ئاشکرا بانگەوازی کردووەو دەستی کردووە بە وانە وتنەوەو چەندین چالاکی لەم بوارەدا.

لە پێناو بانگەوازیدا چەندین جار بۆ ماوەی زۆر لەلایەن دەسەڵاتدارەکانی ئەو وڵاتە دەستگیر کراوە.

---

* سەرچاوە: پێگەی ئەلیکترۆنی ( منبر التوحيد والجهاد)، کە گشت پەرتووك و نوسراو و ووتارەکانی شێخ ( أبو محمد المقدسي) تێدا بڵاوکراوەتەوە، بۆ خوێندنەوەی زیاتر لە ژیاننامەکەی ئەم لینکە بکەوە:

qrikosd٢http://tawhed.ws/a?a=

چەند زانایکی ئەو سەردەمەش پاکانەی دەکەن لەو تۆمەتانەی کە دەدرێنە پاڵی، لەسەروشیانەوە زانای گەورە (حەممودی کوڕی عوقەلای شوعەیبی) –ڕەحمەتی خوای لێبێ– ، کە پەیوەندی تایبەتیان هەبوو، وە جارێکیان دوای بەربوونی (ئەبو موحەممەد) لە بەندیخاندا، (شێخ حەممود) تەلەفۆنی بۆ دەکات و پێی دەڵێ:" بەڕاستی تۆ سەری موسوڵمانانت بەرز کردەوە".

شێخ (ئەبو موحەممەدی مەقدیسی)خاوەنی چەندین پەرتووکە لەوانە:

- ملة إبراهيم ودعوة الأنبياء والمرسلين.
- الكواشف الجلية في كفر الدولة السعودية.
- هذه عقيـدتـنا.
- إمتاع النظر في كشف شبهات مرجئة العصر.
- تبصير العقلاء بتلبيسات أهل التجهم والإرجاء.
- الرسالة الثلاثينية في التحذير من الغلو في التكفير.
- القول النفيس في التحذير من خديعة إبليس.
- الديمقراطية دين.
- وقفات مع ثمرات الجهاد.
- كشف شبهات المجادلين عن عساكر الشرك وأنصار القوانين.
- كشف النقاب عن شريعة الغاب.
- مختصر كشف النقاب عن شريعة الغاب.
- لا تحزن إن الله معنا.
- إعداد القادة الفوارس بهجر فساد المدارس.
- مشروع الشرق الأوسط الكبير.
- النكت اللوامع في ملحوظات الجامع.
- التحفة المقدسية في مختصر تاريخ النصرانية.
- الإشراقة في سؤالات سواقة.

- حسن الرفاقة في أجوبة سؤالات سواقة.
- المصابيح المنيرة في الرد على أسئلة أهل الجزيرة.
- من كان بيته من زجاج فلا يرم غيره بحجر.
- إرشاد المبتدي إلى قواعد السعدي.

وه هەروەها نزیکەی ٥٠ وتارو نامەی نوسیوە لەگەڵ چەندین شیعرو هۆنراوەدا، بۆ خوێندنەوەو بینینی بەرهەمەکانی ئەم زانایە خۆڕاگرە سەردانی پێگەی ( منبر التوحيد والجهاد) بکە.

سوپاس بۆ خوا تاوەکو ئێستاش شێخ (ئەبو محمد المقدسی) جێگیرە لەسەر وتنی حەق و ڕاستی، خوای گەورە بیپارێزێت و سودبەخشی بکات بۆمان.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته...

# پێشەکی  بڵاوکەرەوەو چاپکەری پەرتووك

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان، کـەوا پێغەمبەرەکـەی (محمـد ﷺ) بـە ڕێنومـایی و ئـاینیی راسـت و ڕەوا نـاردووە تـاوەکو بەسـەر گشـت ئاینەکانـدا سەریبخات، هەرچەندە موشریکەکانیش پێیان ناخۆش بێت.

درودو سەلام لەسـەر پێغەمبـەرمان محمـد و خزمـەکانی و هـاوەڵانی، وە لەسـەر هەرکەسێ کە بانگەواز بکات بە بانگەوازی ئەو وە دەستی گرتبێ بە ڕێبازو بەرنامەی ئەوەوە ئەو تا ڕۆژی دوایی.

ئێمە پەرتوکێکی بە نرخ و نایاب پێشـکەش بـە خوێنـەرانی بـەڕێز دەکـەین، ئـەم پەرتووکە سەرەڕای بچووکی قەربارەکەی و، کەمی ژمارەی لاپـەڕەکانی، پـڕە لـە وەڵامـی تەواو بۆ هەرکەسێ پرسیار بکات سەبارەت بە دینی دیموکراسـیەت و بەشـداری کـردن لـە پەرلەمانەکانی یاساداناني شیرکی، ئەم پەرتوکـەش هـی بـرای پایـە بـەرز بـاوکی موحەممـەد عاصیمی مەقدیسیە، یەکێکە لەو بانگخوازانەی کە خۆیان تەرخان کردووە بۆ بەدەستهێنان و بڵاوکردنەوی زاست، لەگەڵ وتنی حەق و ڕاستی بە ئاشکرایی، لە خوا بۆی دەپاڕێینەوە کە تەوفیق و ڕاستە ڕێی بکات وە لێشی قەبوڵ بکات، وە خوای گـەورە خـۆی و زانسـتەکەی سوودبەخش بکات، خوای گەورە بەخشندەو باڵادەستە.

وە داوا لەو خوێنەرانە دەکەین کە بـە دوای ڕاسـتیدا دەگـەڕێن ئـەو پەیامـە بـێ لایەنانە بخوێننەوە تەنها بۆ خوا لەپێناو گەیشتن بە ڕاستی و شوێنکەوتنی.

خوایە حەق و ڕاستیمان بە ڕاست نیشان بدە، وە شوێنکەوتنیمان پێ ببەخشـە، وە نارەواییمان بە نارەوا نیشان بدە، وەخۆپاراستنمان لێی پێ ببەخشە.

لە خوای بەرزو بەتوانا داوا دەکەین کە ئەو کارەمان بکات بە کارێکی دڵسـۆزانە لە پێناو گەیاندنی پەیامی حەق، وە سودبەخش بۆ بەندەکانی، ئەو خاوەنی ئەمەیـەو توانـادارە لەسەری. وصلى الله على محمد وآله وصحبه وسلم.

بڵاوکەرەوەو چاپکەری پەرتووك

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای گەورە، سوپاسی دەکەین، وە داوای یارمەتی لێ دەکەین، وە داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەین، وە خۆمان دەپارێزین بە خوا لە خراپیەکانی دەروونمان وە لە کردەوە خراپەکانمان، ئەوەی خوا ڕێنومایی بکات ئەوە ڕێنومای کراوە، وە ئەوەی گومڕای بکات ئەوە هەرگیز هاوکارێکی ڕێنیشاندەری بۆ نادۆزیەوە، وە شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە الله نەبێت، تاك و تەنیایە و بێ شەریکە، ئەو بەسمانە کە باشترین پشت و پەنایە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە، ئەو پێشەوامانە، وە سەرمەشقمانە، خوا درودو سەلامی لەسەر داوە وە لەسەر خزمەکانی و هاوڕێکانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی...

جا ئەمە چەند پەڕێکە کەبە پەلە لەبەردەم هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی یاسادانانی شیرکی نوسیومە، ئەمەش پاش ئەوەی کە خەڵکی فریودراون و لەخشتەبراون بە بەلای دیموکراسیەتدا، وە زۆربلێکان مشتومڕیان لەسەر کردووە لە طاغوتە ترازاو و دەرچووەکان لە دین یان ئەوانەی بەرگی دین و بانگخوازیان پۆشیوە...وە حەق و ڕاستیان پۆشیوە بە باطیل و نارەوایی، جارێك ناوی دەنێن ئازادی...وە جارێك ناوی دەنێن شوراو ڕاوێژ...وە جارێك بەڵگەی بۆ دەهێننەوە بە کار لە ئەستۆگرتنەکەی یوسف – درودو سەلامی خوای لەسەربێت– لای پاشاکە...وە جارێك بە فەرمانڕەوایەتی نەجاشی...وە هەندێکی تر بە –بیانوی– بەرژەوەندیەکان و بە چاکزانینەکان...بۆ ئەوەی ڕاستی لە خەڵکی گەمژە بە نارەوایی و ساختەیی ڕووکەش بکەن ، وە بۆ ئەوەی ڕوناکی تێکەڵ بکەن بە تاریکی، وە شیرك بە یەکتاپەرستی و بە ئیسلام...ئێمەش بە پشتیوانی خوای گەورە بەرپەرچی گشت ئەو گومانانەمان دایەوە وە ڕوونمان کردەوە کە بێگومان دیموکراسی ئایینێکە جگە لە ئایینی خوا وە ڕێبازێکە جگە لە ڕێبازی یەکتاپەرستی، وە ئەنجومەنەکانی نوێنەرانیش شتێك نیە تەنها کۆشك و تەلارن بۆ شیرك و هاوبەشی دانان، وە قەلاّن بۆ بتپەرسی کە خۆلێ دوورخستنەوەیان پێویست و واجبە بۆ جێبەجێکردن و تەواوکردنی یەکتاپەرستی، کەوا مافی خوای گەورەیە لەسەر بەندەکان، بەڵکو هەوڵدان بۆ ڕماندنی و دژایەتی کردنی

پشتیوانەکانی و رق لێبونەوەیان و جیهاد کردنیشیان پێویست و واجبە...ئەمەش شتێکی ئیجتیهادی نیە هەروەك لای هەندێك لە پۆشەرانی شیرینە کە وای لێبکەن –و بیخەنە ئەو بازنەیەوە–...بەڵکو ئەمە شیرکێکی ڕوون و ئاشکرایە، وە کوفرێکی دیارو بێ خەوشە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاگاداری داوە لەبارەیەوە، وە پێغەمبەریش ﷺ بە درێژایی ژیانی شەڕی ئەمەی کردووە...

جا بڕواداری یەکتاپەرست سووربە بۆ ئەوەی ببی بە شوێنکەوتەکانی پێغەمبەرو ﷺ پشتیوانانی، کە شیرك و موشریکەکان فڕێ دەدەن، وە لە سێبەری ئەم غەریبایەتیەدا پەلە بکە بۆ گەیشتن بە کاروانی ئەو گروپەو کۆمەڵەی کەوا وەستاوە بە دینی خوای گەورە، ئەو گروپەی پێغەمبەرﷺ لەبارەیانەوە دەفەرموێ: "لا تزال طائفةٌ من أُمتي قائمةً بأمر الله لا یضرهم من خذلهم ولا من خالفهم حتی یأتي أمر الله" [واتە: بەردەوام تاقمێك لە ئوممەتی من وەستاو و سەرکەوتوون بە فەرمانی خوا، زیانیان پێ ناگەیەنێ ئەوکەسەی خەجاڵەتیان بکا وە ئەوکەسەی پێچەوانەیان بێت، تاوەکو فەرمانی خوا دێت]، خوای گەورە من و تۆ بکاتە یەکێك لەوانە، سوپاس و ستایشی بێ پایەن بۆ خوا.

باوکی موحەممەد عاصمی مەقدیسی

# بەشێك

# بۆ ڕوونكردنەوەی بنچینەی بنچینەكان و بۆ ڕوونكردنەوەی ئامانج و مەبەست لە دروستكردنی ئەم بوونەوەرەو ناردنەخوارەوەی پەرتووكە ئاسمانیەكان و بانگەوازی پێغەمبەران و ڕێبازی ئیبراهیم و گرێ قایم و بەهێز كە تەوەری ڕزگار بوونی لەسەرە

بزانە – خوای گەورە ڕەحمت پێ بكات– كە لوتكەو پۆپەی ئەو فەرمانە (دینـە) و بنچینەو كۆڵەكەكەی، وە یەكەم شتێك كە خوا لەسـەر نـەوەكانی ئـادەم فـەرزو پێویسـتی كردووە كە بیزانێ و جێبەجێی بكات بە كردار، پێش نوێژ و ڕۆژوو گشـت پەرستشـەكانی تر، بریتیە لە كوفر كردن بە طاغوت و خۆپاراستن لێی، وە پاككردنەوەی یەكتاپەرسـتی بـۆ خوای گەورە، لە پێناو ئەمەدا خوای گەورە بوونەوەری دروست كردوەو پێغەمبەرانی ڕەوانە كردووەو پەیامەكانی دابەزاندووەو جیهاد و تێكۆشان و شـەهید بـوونی دانـاوە...وەمشـت ومڕی نێوان ئەولیاكانی خوداو ئەولیاكانی شەیطان هەر لەم پێناوەدا بووە، وە لـە بنچـینەدا لە پێناوئەمەدایە كە دەوڵەتی ئیسـلامی و جێنیشـی ژێـرو هۆشمەنـد دادەمـەزرێت... خـوای گەورە فەرمویەتی:" **وما خلقتُ الجن والإنس إلا ليعبدون**"[1] [واتـە: وە مـن جنۆكـەو ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست كردووە كە بەندایەتی من بكەن]. وەهەروەها دەفەرموێ:" **ولقد بعثنا في كلِّ أمةٍ رسولاً أنِ اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت** "[2] [واتە: سوێند بە خوا ئێمە

---

[1] سورەتی (الذاريات) ئایەتی ٥٦.

[2] سورەتی (النحل) ئایەتی ٣٦.

لەناو هەر گەل و ئومەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی تەنها خوا بپەرستن و دوور کەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر].

ئەمەش گەورەترین گرێیە لە گرێکانی ئیسلام، بیّ ئەمە نە بانگەوازو نە جیهادو نە نوێژو نە ڕۆژوو نە زەکات و نە حەج وەرناگیرێت و قەبوڵ نابێت، وە ڕزگار بوون لە ئاگری دۆزەخ ناکریّ بەبیّ دەستگرتن پێی، چونکە ئەمە تاکە گرێیە کە خوای گەورە زەمانەتی پیّ داوین کەوا لەت نابیّ و ناترازیّ قلێشی تیّ ناکەوی، وە جگە لەم گرێیە گرێکانی تری دین و شەریعەتەکانی بەتەنهاو بەبیّ ئەم گرێیە بەس نیە بۆ ڕزگاربوون...خوی گەورە فەرمویەتی:" **قد تبيَّن الرُّشد مِن الغَيِّ فمن يكفر بالطاغوت ويُؤمن بالله فقد استمسك بالعُروة الوُثقى لا انفصام لها...** "[٣] [واتە: بەڕاستی لەیەك جیابۆتەوە و ڕێنمویی و شارەزایی لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی کوفر بە طاغوت بکات و باوەڕیش بە خوا بهێنیّ، ئەوە بێگومان بەتوندی دەستی گرتووە بە بەهێزترین گرێوە، کە پچڕان و بەربونی بۆ نیە...]، وە دەفەرمویّ:" **والذين اجتنبوا الطاغوت أن يعبدوها وأنابوا إلى الله لهمُ البشرى فبشر عباد**"[٤] [واتە: وە کەسانیّ لە پەرستنی بت ( و هەموو پەرستراوێکی تر) خۆیان پاراستووە وە گەڕاونەتەوە بۆ لای خوا، مژدەی گەورە تەنیا بۆ ئەوانە، کەواتە مژدە بدە بە بەندەکانم].

سەرنج بدە چۆن خوای گەورە لە قورئاندا کوفر کردن بە طاغوت و خۆلێپاراستنی پێش خستووە لەسەر باوەڕ هێنان پێی و گەڕانەوە بۆی... تەواو وەك ئەوەی چۆن لە ووشەی یەکتاپەرستیدا " لا إله إلا الله – هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە الله نەبیّ–" نەفی کردنی –پەرستن بۆ هەر کەسێکی– پێشخستووە بەسەر چەسپاندنی تەنها بەخوا...ئەمەش لەبەر هیچ نیە تەنها بۆ وریاکردنەوەیە لەسەر ئەم ڕوکنە گەورەیە لەو گرێبەستە پتەو و قایمەدا، بۆیە باوەڕ هێنان بە خوا دروست نابێت وە سود نابەخشیّ مەگەر لە سەرەتادا کوفر بە طاغوت کرابیّ...

---

[٣] سورەتی (البقرة) ئایەتی ٢٥٦.

[٤] سورەتی (الزمر) ئایەتی ١٧.

**وە ئەو طاغوتەی کە لەسەر تۆ پێویستە کوفری پێ بکەی و خۆت لە پەرستنی بپارێزی بۆ ئەوەی دەست بگری بە گرێی پتەوی ڕزگاری تەنها بریتی نیە لە کۆمەڵە بەرد و بت و دار و قەبرێك کەوا دەپەرسترێن بە سوجدە بردن یاخود نزاو پاڕانەوە یان نەزرکردن یاخود سوڕانەوە بەدەوریانداو بەس... بەڵکو -مانای طاغوت- لەمە گشتگیرترە...بەڵکو (گشت پەرستراوێك کەوا جگە لەخوای گەورە بەهەر جۆرێك لە جۆرەکانی پەرستن پەرسترا بێت و ئەویش هیچ نکۆڵی لێ نەکا) [٥] دەگرێتەوە.**

**جا (طاغوت) لە (طغیان) داتاشراوە، کە بریتیە لەوەی دروستکراو ئەو سنوورە ببەزێنێ کە خوای گەورە بۆی داناوە...وە پەرستشیش چەندین جۆرە، جا هەروەك سوجدەو کڕنووش و نزاو نەزرو سەربڕین پەرستشە، ئا ئاواش گوێڕایەڵیکردن لە شەرع و یاسا دانان پەرستشە... خوای گەورە لەبارەی گاورەکان دەفەرموێ:" اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أرباباً من دون الله "[٦] [واتە: -گاورو جو- زاناو عابیدەکانیان کردوە بە پەروەردگار لەجیاتی خوا]، ئەوانە سوجدە یاخود کڕنووشیان بۆ زاناکانیان نەدەبرد...بەڵکو گوێڕایەڵیان کردن حەلال کردنی حەرامەکان و حەرامکردنی حەلاڵەکان و لەگەڵ ئەوان لەسەری کۆك بوون، جا خوای گەورە ئەم (گوێڕایەڵیەیانی) دانا بە پەروەردگار بۆ خۆ دانان...چونکە گوێڕایەڵی لە یاساو دەستوور پەرستشە و نابێ بۆ کەسێ بکرێ جگە لەخوا...وە ئەگەر کەسێك ئەم پەرستشە بۆ جگە لەخوا بکا ئەوە پێی موشریك دەبێ ئەگەر لە یەك حوکم و بڕیاریشدا بێت...**

**ئەو وتوێژەی لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ کە لە نێوان ئەولیاکانی خوای گەورەو ئەولیاکانی شەیطان ڕویدا سەبارەت بە گۆشتی مردارەوە بوو و حەرامیەکەی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەمە بە بەڵگەیەکی ڕوون، کاتێ موشریکەکان ویستیان باوەڕ بە موسوڵمانان بهێنن کە جیاوازی نیە لەنێوان ئەو کاوڕەی موسوڵمانان سەری دەبڕن لەگەڵ ئەو کاوڕەی خۆی**

---

[٥] بەم مەرجە ئەوانە دەردەهێنرێن کە پەرستراون لە فریشتەکان و پێغەمبەران و پیاوچاکان کە ڕازی نین بە پەرستنیان، جا ناونانرێن بە طاغوت وە خۆیان لێ بەری ناکرێ، بەڵکو خۆیان لە پەرستنیان و ئەوانەش کە دەیان پەرستن بەری دەکرێ، وە لەوانەی کە پەرستیتیان وەك عیسای کوڕی مەریەم -سەلامی خوای لەسەر بێت-.

[٦] سورەتی (التوبة) ئایەتی ٣١.

دەمرێ، بەو بەڵگەو گومانەی ئەوەی کە مردارەوە بوو لەڕاستیدا خوای گەورە سەری بڕیوە، جا خوای گەورە لەم ڕووداوە بڕیاری خۆی لەسەروی حەوتەم ئاسمانەوە ناردە خوارەوە کە فەرمووی:" **وإن أطعتموهم إنكم لمشركون** "[7] [واتە: جا ئەگەر بەگوێیان بکەن ئەوە بێگومان لە هاوبەش بڕیاردەران دەبن].

جا هەرکەسێ خۆی بکاتە یاسادانەر لەگەڵ خوا، جا ئەو کەسە دادوەر بێت یان بڕیار بەسەردراو، ئەندام بێت لە دەسەلاٚتی یاسادانان یاخود نوێنەری ئەو بێت لەوانەی هەڵێانبژاردووە، ئەوا دەچێتە نێو ناو –و ناوەڕۆکی– طاغوتەوە... چونکە بەمە سنووری خۆی بەزاندووە کە خوای گەورە بۆی داناوە، لەبەر ئەوەی خۆی دروست کراوە بە بەندەی خوا، وە گەورەکەی فەرمانی پێکردووە کەوا ملکەچ بێت بۆ شەرع و بەرنامەکەی، بەلاٚم ئەو سەرپێچی کردو و خۆی بە گەورە زانی و زیادەڕۆیی کرد و سنووری خوای گەورەی تێپەڕاند، کە ویستی خۆی وەك خودا لێبکات و هاوبەش بێت لەگەڵی بە شێوەو سیفەتی یاسادانان کە جگە لە خوای گەورە نابێ کەسی پێ وەسف بکرێ... وە هەرکەسێك ئەم کارە بکات ئەوە بەڕاستی خۆی کردۆتە خوایەکی یاسادانەر، ئەمەش بێ گومان لە سەرو پۆپلەکانی طاغوتەکانە کە یەکتاپەرستی و موسوڵمانیەتی هیچ کەسێکی پێ دروست نابێ تاوەکو کوفری پێ نەکات و خۆی لێ دوورنەخاتەوە و خۆی لە بەندەو پشتیوانەکانی بەری نەکات...

خوای گەورە دەفەرموێ:" يُريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت وقد أُمِروا أن يكفروا به "[8] [واتە: دەیانەوێت – بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان– دادوەری بەرن بۆ لای طاغوت، لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێکراوە کوفری پێ بکەن].

موجاهید دەڵێ:( طاغوت..شەیتانە لە وێنەو شێوەی مرۆڤدا کە فەرمانڕەوایی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش خاوەن فەرمانیتیان).

---

[7] سورەتی (الأنعام) ئایەتی ١٢١. وە بۆ هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە بگەڕێوە، کە (حاکم) لە (مستدرك)ەکەیدا لە (إبن عباس)ەوە بە سەنەدێکی دروست –صحيح– گێڕاویەتەوە.

[8] سورەتی (النساء) ئایەتی ٦٠.

کەڵەزانای ئیسلام ئیبن تەیمیە –ڕەحمەتی خوای لێ بێت– دەڵـێ:( وە بۆیـە ئـەوەی دادوەری و حوکم و بڕیاری بۆ دەگێڕدرێتەوە لەوانـەی فـەرمانڕەوایی بـە پـەرتووکی خـوا ناکەن ناونراوە بە طاغوت)[٩].

وە ئیبن قەییم – ڕەحمەتی خوای لێ بێت– دەڵێ:( طاغوت هەر شـتێکە کـە بەنـدە سنوورەکەی پێ ببەزێنێ لە پەرستراو یان شوێنکەوتە یان گوێڕایەڵی بۆ کراو، جا طاغوتی هەر گەل و قەومێك ئـەو کەسـەیە کـەوا حـوکم و بڕیـاری بـۆ دەگەڕێنـەوە جگـە لـە خـوداو پێغەمبەرەکەی، یاخود جگە لە خوا دەیپەرستن، یاخود شوێنی دەکەون بەبێ چاوڕونیەك لـە خواوە، یاخود گوێڕایەڵی دەکەن لەو شتانەی کە نازانن گوێڕایەڵی کردنی بۆ خوایە)[١٠].

وە هەروەها دەڵێ:( هەرکەسێ حوکمی بردەوە لای کەسـێ یـان شـتێکی کـردە حـاکم جگـە لـە وەی کـە پێغەمبـەر ﷺ هێناویـەتی، ئـەوە طـاغـوتی کردۆتـە حـاکم و حوکمەکەی بۆ لای ئەو گەڕاندۆتەوە)[١٠].

جا لە جۆرەکانی طـاغوتەکان کە لەم ڕۆژگارەدا جگـە لـە خـوا دەپەرسـترێن، و لەسەر هەر یەکتاپەرستێك پێویست و واجبە کوفری پێ بکات لە خـۆی و شـوێنکەوتەکانی خۆی بەری بکات بۆ ئەوەی دەستبگرێت بە دەستبەندە پتەو و قایمەکـەو ڕزگـاری بێـت لـە ئاگر، ئەو خوا درۆینانە ئەو بەناو پەروەردگارانەن کەوا زۆرێك لـە خـەڵکی کردویـانن بـە هاوبەشی یاسادانەر جگە لە خوای گەورە..." **أَمْ لهم شُركاءُ شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله ولولا كلمةُ الفصل لقُضِيَ بينهم....**"[١١] [واتە: ئاخۆ ئەو (بێ باوەڕ)انە هاوبەشێکیان هەیە کە بەرنامەو شەرعیان بۆ داناون کە خوا ڕێگەی پێ نەداوە، وە ئەگەر بڕیاری یەکجاری دەرنەچوایە لە نێوانیان دا بڕیار دەدرا –بـە لـەناوبردنیان–...]. کـەوا شـوێنیان کـەوتوون لەوەی یاسادانان ماف و تایبەتمەندیەکی ئەوان و پەرلەمانەکەو دەستە فەرمانڕەوا نێو دەوڵەتی یان هەرێمی یان نێوخۆییەکەیانـە... وە لـە قـانون و دەسـتوورەکانیاندا بـە دەق نوسـیویانە،

---

[٩] مجموع الفتاوى: بەرگی ٢٨ لاپەڕە ٢٠١.

[١٠] اعلام الموقعين عن ربِّ العالمين: بەرگی ١ لاپەڕە ٥٠.

[١١] سورەتی (الشورى) ئایەتی ٢١.

ئەمەش لای ئەوان شتێکی ناسراو و ناودارە[١٢]، جا بەمە بونەتە پەروەردگاری هەرکەسێك کە گوێڕایەڵیان دەکات و شوێنیان دەکەوێت وە لەسەر ئەم کوفرو شیرکە ڕوونە لەگەڵیان ڕێك بکەوێت، هەروەك چۆن خوای گەورە بڕیاری بەسەر گاورو دیانەکان دا کاتێ شوێن زاناو عابیدەکانیان کەوتن لە شتێکی وەك ئەمەدا... بەڵکو بارودۆخی ئەمانە خراپترو پیسترە، چونکە ئەو زانایانە ئەمەیان کردو لەسەری ڕێککەوتن بەڵام نەیانکرد بە قانوون یان ڕێکیان نەخست، وە دەستوور و پەرتووك و مەراسیمیان بۆ دانەنا بە جۆرێ ئەوەی لێی دەربچێ و تانەی لێ بدا سزا بدرێت، وە یەکسانیان نەکرد بە پەرتوکی خوا یان زاڵی بکەن و بیکەن بە حاکم لەسەری، هەروەك حاڵی ئەمانە –ی ئەمڕۆ– وایە...

ئەگەر ئەمە تێگەیشتی، ئەوە چاك بزانە کە گەورەترین پلەکانی دەستگرتن بەم گرێیە پتەو و قایمەو بەرزترین پایەکانی کوفر کردن بە طاغوت، بریتیە لە لوتکەی ئیسلام، مەبەستم جیهاد کردنیەتی، وە جیهاد کرنی پشتیوانان و شوێنکەوتەکانیەتی و هەوڵدانە بۆ ڕماندنی، وە دەرهێنانی خەڵکە لە پەرستنی بۆ تەنها پەرستنی خوای گەورە... وە لەوانەش درکاندنی ئەو ڕاستیەو ئاشکراکردنیەتی هەروەك ئەمە کارو ڕێگەی پێغەمبەران بووە کە خوای گەورە بە جوانترین شێوە بۆمانی ڕوونکردۆتەوە، کاتێ فەرمانمان پێدەکات کە

---

[١٢] دەقی ماددەی ژمارە ٥١ لە دەستووری کوێتی:( دەسەڵاتی یاسادانان ئەمیر و ئەنجومەنی گەل سەرپەرشتی دەکەن بەگوێرەی دەستوور)، وە خوشکە نا شەرعیەکەی لە دەستووری ئوردنی ماددەی ژمارە ٢٥:( دەسەڵاتی یاسادانان بە پاشا و ئەنجومەنی گەلەوە دەبەسترێتەوە). وە هاوشێوەکەشی لە دەستووری میصری ماددەی ژمارە ٨٦:( ئەنجومەنی گەل سەرپەرشتی دەسەڵاتی یاسادانان دەکات).

[ ماددەی ٦١ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق:( ئەنجومەنی نوێنەران ئەم کارانەی خوارەوەی لە ئەستۆ دایە: یەکەم: دانانی یاسا فیدراڵیەکان)، وە هەروەها ماددەی ٧٣:( سەرەك کۆمار ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوەی هەیە: ... سێیەم: پەسەندکردن و دەرکردنی ئەو یاسایانەی ئەنجومەنی نوێنەران دایدەنێن، یاساکانیش بە پەسندکراو دەژمێردرێن پاش تێپەڕبوونی ١٥ ڕۆژ بەسەر ناردنیان بۆ سەرۆك کۆمار).

ماددەی ٤٠ لە پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق:( پەرلەمانی کوردستان–عێراق دەسەڵاتی یاسادانان و سەرچاوەی بڕیاردانە لەسەر پرسە چارەنووس سازەکانی گەلی هەرێمی کوردستان)، وە ماددەی ٥٣ :( پەرلەمان بێجگە لەو ئەرکانەی بەپێی یاسا کارپێکراوەکانی هەرێم پێی دەسپێردرێن ئەم ئەرکانەشی لەسەر شانە: ... سێیەم: ١– دانانی یاسا لە هەرێمی کوردستان...)، وە هەروەها ماددەی ٥٤ :( بەدەر لەو حوکمی بڕگەی (حەوتەم)ی ماددەی (٦٥)، کە لەم دەستوورەدا هاتووە، پەرلەمان بۆی نیە واز لە دەسەڵاتەکانی یاسادانانی خۆی بێنێ)].

شوێنکەوتەی ڕێبازو بەرنامەی ئیبراهیم و بانگەوازەکەی بین کە دەفەرموێ:" **قد كانت لكم أسوة حسنة في إبراهيم والذين معه** [١٣] **إذ قالوا لقومهم إنا بُرءاؤا منكم ومما تعبدون من دون الله كفرنا بكم وبدا بيننا وبينكم العداوة والبغضاء أبداً حتى تُؤمنوا بالله وحده**"[١٤] [واتە: بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە سەرمەشقێکی جوان و چاك لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵێدا بوون کە بە گەلەکەی خۆیانیان ووت: بەڕاستی ئێمە بێزارو بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، ئێمە باوەڕمان بە ئاینی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی بۆ هەمیشە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا بەرپا بوو تا ئە کاتەی بڕوا بە خوای تاك و تەنها دەهێنن]. جا کە دەفەرموێ:"بَدَا "—واتە: ڕوون بویەوە و ئاشکرا بوو... وە سەرنجی پێشکخستنی دوژمنایەتی لەسەر ڕقبوونەوە بدە – لە ئایەتەکەدا–، چونکە گرینگترە لەبەر ئەوەی لەوانەیە مرۆڤەکە ڕقی لە پشتیوانانی طاغوت ببێتەوەو دژایەتیشیان نەکات، جا بەم جۆرە واجبەکەی جێبەجێ نەکردووە تاوەکو دوژمنایەتی و رق لێبوونەوەی لێ دێتەجێ...

وە سەرنج بدە چۆن خوای گەورە بەریبوونیان لە گەلە موشریکەکان لەپێش بەریبوونیان لەوانەی دەیانپەرستن باس کردووە، چونکە یەکەمیان گرنگترە لەوەی دووەمیان... ئەمەش لەبەر ئەوەی زۆر لە خەڵکی خۆی لە بتەکان و طاغوتەکان یان دەستوور و قانون و ئایینە پوچەکەیان بەری دەکات، بەڵام خۆی لە بەندە و پشتیوان و دەستوپێوەندەکانیان بەری ناکات...جا بەم جۆرە واجبەکەی نەکردووە...بەڵام ئەگەر خۆی بەری کرد لە بەندە موشریکەکان ئەوە خۆ بەری کردن لە پەرستراوەکان و ئایینە پوچەڵەکانیان پێویست دەکات[١٥]...

---

[١٣] هەندێ لە توێژەرەوانانی قورئان گوتویانە: (الذين معه– ئەوانەی لەگەڵێنە–) واتە: شوێنکەوتەکانی یان ئەو پێغەمبەرانەی لەسەر ڕێگای ئەون.

[١٤] سورەتی (الممتحنة) ئایەتی ٤.

[١٥] سوود وەرگیراوە لە ( سبيل النجاة والفكاك من موالاة المرتدين وأهل الإشراك)ی (حەمەدی کوڕی عەتیق)...وە بگەڕێوە بۆ پەرتووکی ئێمە: (ملّة إبراهيم ودعوة الأنبياء والمرسلين وأساليب الطغاة في تمييعها وصرف الدعاة عنها) چاپی نور بۆ ڕاگەیاندنی ئیسلامی.

بەلاَم نزمترین پلەکانی کە پێویستە لەسەر گشت بەرپرسیارو موکەللەفێك وە کەس ڕزگاری نابێ بێ ئەم پلەیە... بریتیە لە خۆپاراستن لە طاغوت و نەپەرستنی یاخود شوێن نەکەوتنی شیرك و ناڕەواییەکەی.. خوای گەورە دەفەرموێ:" **ولقد بعثنا في كلِّ أمةٍ رسولاً أنِ اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت**"[١٦] [واتە: سوێند بە خوا ئێمە لەناو هەر گەل و میللەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوە لە (پەرستنی) هەر پەرستراوێکی تر]. وە دەفەرموێ:" **فاجتنبوا الرجس من الأوثان**"[١٧] [واتە: کەواتە خۆتان دووربخەنەوە لەو پیسیە کە بتەکانە]. وە سەبارەت بە نزاکەی ئیبراهیم دەفەرموێ:" **واجْنُبْنِي وبنيّ أن نعبد الأصنام**"[١٨] [واتە: وە خۆم و کوڕەکانم دوورخەرەوە لەوەی بتەکان بپەرستین]. ئەمەش ئەگەر کەسێ لە دونیادا بە تەواوی جێبەجێی نەکات و ئێستا خۆی دوورنەخاتەوە لە طاغوت و پەرستنی یان شوێنکەوتنی، ئەوە لە دوارۆژدا لە دۆڕاوەکان و خەسارەتمەندەکانە... جا ئەو کات هەرگیز شتێکی تر لە ئایین سوودی پێناگەیەنێ یا هیچی بۆ ناکات ئەگەر کەمتەرخەمی هەبوو لەو بنچینە ڕەسەنە، وە پەشیمان دەبێتەوە کاتێ کە پەشیمانی سودی نابێ، کە خۆزگە دەخوازێ ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ دونیا بۆ جێبەجێکردنی ئەو بنچینە گەورەیەو بۆ ئەوەی دەست بگرێت بەو گرێیە پتەو و قایمە، وە بۆ ئەوەی شوێن ئەو ڕێبازە گەورەیە بکەوێت...

خوای گەورە دەفەرموێ:" **إذْ تبرأ الذين اتُّبِعوا من الذين اتَّبعوا ورأوُا العذاب وتقطَّعت بهمُ الأسباب * وقال الذين اتَّبَعوا لو أن لنا كرةً فنتبرأ منهم كما تبرءُوا منا كذلك يُريهِمُ الله أعمالهم حسراتٍ عليهم وما هم بخارجين من النار**"[١٩] [واتە: کاتێ کە پێشەواکان خۆیان بەری دەکەن لەوانەی (لە دونیادا) دوایان کەوتبوون، وە سزایان ( بە چاوی خۆیان) بینی، وە هەموو پەیوەندیەکیان پچڕایەوە، وە ئەوانەی کە دوایان کەوتبوون ووتیان: خۆزگە

---

[١٦] سورەتی (النحل) ئایەتی ٣٦.

[١٧] سورەتی (الحج) ئایەتی ٣٠.

[١٨] سورەتی (إبراهیم) ئایەتی ٣٥.

[١٩] سورەتی (البقرة) هەردوو ئایەتی ١٦٦-١٦٧.

ئێمه بگەڕاینایەتەوه (بۆ دونیا) تا خۆمان لێیان بەری بکردایه هەروەك (ئەوان) خۆیان لە ئێمه بەری کرد، ئاوا خوا کردەوەکانیان نیشان دەدات بە ئاخ و حەسرەت لەسەریان، وه ئەوانه هەرگیز لە ئاگر دەرچوونیان نیه].

بەڵام دووره...زۆر دووره، تازه کات تێپەڕی و کەڕەت و گەڕانەوه بۆ دونیا نیه، جا ئەی بەندەی خوا ئەگەر ڕزگاریت دەوێت وه داوای ئومێدی بەزەیی پێ هاتنەوەی پەروەردگارت دەکەیت کە بۆ ئەوانەی نوسیوه کە خۆیان دەپارێزن، ئەوه خۆت بپارێزه لە گشت طاغوتەکان، ئێستا خۆت بپارێزەو دوورکەوەرەوه لە شیرکەکانیان، ئێستا... چونکه کەس لە ڕۆژی دوایی خۆیان لێ ناپارێزێت و لە دواڕۆژی ئەوان ڕزگاری نابێت مەگەر ئەوەی لە دونیادا لێیان جیابوبێتەوەو خۆی لێیان پاراستبێت... بەڵام ئەوەی بە ئاینه پوچەڵ و ناڕەواکەیان ڕازی بووه وه لەسەری شوێنیان کەوتووه ئەوا بانگدەرێك لە گۆڕەپانی ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکات:" من كان يعبدُ شيئاً فليتبعْهُ، فيتَّبعُ من كان يعبدُ الشمسَ الشمسَ، ويتَّبعُ من كان يعبدُ القمرَ القمرَ، ويتبعُ من كان يعبدُ الطواغيتُ الطواغيتَ..) " [واته: ئەوەی -لە دونیادا- شتێکی دەپەرست با شوێنی بکەوێت، جا ئەوەی ڕۆژی دەپەرست شوێن ڕۆژ دەکەوێت، وه ئەوەی مانگی دەپەرست شوێن مانگ دەکەوێت، وه ئەوەی طاغوتی دەپەرست شوێن طاغوت دەکەوێت...] تا لە فەرموودەکەدا دەگاتە سەر باوەڕدارەکان کاتێ پێیان دەگوترێ:" ما يحبسكم وقد ذهب النّاس؟ فيقولون: فارقناهم ونحن أحوج منا إليه اليوم، وإنا سمعنا منادياً ينادي، ليلحق كلُّ قومٍ بما كانوا يعبدون وإنما ننتظر ربَّنا"[20] [واته: چ شتێك ئێوەی وەستاندوه، وه خەڵکی هەمووی ڕۆیشتن؟ دەڵێن: لە دونیادا لێیان جیابوینەوه وه ئەمڕۆ ئێمه لەخۆمان زیاتر پێویستمان بەو جیابونەوه هەیه، وه ئێمه گوێمان لە بانگدەرێك بوو بانگی دەکر: با هەر گەلەو پەیوەندی بکات بەوەی کە -لە دونیادا- دەیانپەرست، وه ئێمه -ئێستا- چاوەڕوانی پەروەردگارمانین].

---

[20] بوخاریی و موسلیم گێڕاویانەتەوه، -ئەم فەرمووده- بەشێکە لەو فەرموودەیەی -کە باسی- بینینی خوای گەوره دەکات لە لایەن باوەڕدارانەوه لە ڕۆژی دواییدا.

جا سەرنج بدە وتەی باوەڕداران:" فارقناهم ونحن أحوجُ منا إليـه " واتـە: خۆمـان لێیان جیا کردەوە لـە دونیـادا... وە ئێمـە –ئـەو کـات– پێویسـتمان بـە درهـەم و دینـارو کاروباری دونیایان بووین... جا چۆن لێیان جیا نابینەوە لـەم شـوێنە گەورەیـە...جـا لـەمـە هەندێ نیشانەی ڕێگا هەیە...وە لـەوانەش فەرموودەی خوای گەورە:" **احشروا الذين ظلموا وأزواجهم وما كانوا يعبدون**"[21] [واتە: –خوا بە فریشتەکان دەفەرموێ:– ئەوانەی ستەمیان کرد کۆیان بکەنەوە لـەگەڵ هاوڕێکانیان (هاو وێنەکانیان) وە ئەو شتانەی کە دەیانپەرسـت].

(أزواجهم) واتـە: هاوشـێوەکانیان وە هاوڕێکانیـان وە دەسـتوپێوەندەکانیان پشـتیوانەکانیان لـەسـەر نارەواییەکانیانـدا...پاشـان خـوای گـەورە دەفـەرموێ:" **فـإنهم يومئـذ في العـذاب مشتركون إنا كذلك نفعل بالمجرمين إنهم كانوا إذا قيل لهـم لا إلـه إلا الله يسـتكبرون**"[22] [واتە: بەڕاستی هەموویان لـەو ڕۆژەدا لـە سزادا هاوبەشن، بێگومان ئێمە تاوانباران بەو جۆرە لێ دەکەین، بەڕاستی هەرکاتێ بەوانە بوترایە هیچ پەرستراوێك نیە بێجگە لـە الله خۆیـان بـە گەورە دەزانی و – ملکەچی نەدەبوون–].

جا ئەی بەندەی خوا نەکەی پشت بکەی لـە وشەی یەکتاپەرسـتی و کەمتەرخـەمی بکەی لـە چەسپاندنی ئەوەی (وشەی یەکتاپەرستی) چەسـپاندویەتی و –کەمتەرخـەمی بکـەی لـە– نەفی کردنی ئەوەی نەفی کردووە، وە نەکەی خۆت بەگەورەتر بزانی لـە شـوێنکەوتنی حەق و ڕاستی و سووربی لـەسەرخستنی طاغوت، نەوەك لـەگـەڵ فـەوتاوان و بەهیلاکچـوان دەبی... وە بەشداریان دەکەی لـە دوارۆژیان...

پاشان بزانە کە خوای گەورە ئەو یەکتاپەرستیە پاکەو ئـەو بنچـینە پتـەوەی زامـن کردووە، دینی ئیسلام، وە هەڵبژاردووە بۆ بەندە یەکتاپەرستەکانی، ئەوەی بەم –ئـایین–ەوە بێـت ئەوە لێی وەردەگیرێ، وە ئەوەی بە ئاینێکی تـر لـە ئاینـەکان هـاتبێ ئـەوە بەڕوویـدا دەدرێتەوەو لـە دۆڕاوەکانیش دەبێت...خوای گەورە دەفەرموێ:" **ووصى بهـا إبـراهيمُ بنيـه ويعقوبُ يا بنيَّ إن الله اصطفى لكـم الـدين فـلا تمـوتُنَّ إلا وأنـتم مسـلمون**"[23] [واتـە: وە

---

[21] سورەتی (الصافات) ئایەتی ٢٢.

[22] سورەتی (الصافات) ئایەتەکانی ٣٣-٣٥.

[23] سورەتی (البقرە) ئایەتی ١٣٢.

ئیبراهیم و یەعقوب ئامۆژگاری کوڕەکانی خۆیانیان کرد بە ئیسلام بوون، –هەریەك لـەوان فەرمویەتی– ڕۆڵەکانم: بەڕاستی خوا ئاینی ئیسلامی بـۆ هەڵبـژاردوون، کەواتـە مـەمرن بـە موسوڵمانی نەبێت].

وە دەفەرموێ:" **إنَّ الدينَ عِندَ اللهِ الإسْلاَم**"[٢٤] [واتە: بەڕاستی دین و ئایینی پەسند لای خوا تەنها ئایینی ئیسلامە].

وە دەفەرموێ:" **ومَن يَبتغِ غيرَ الإسلام ديناً فلـن يُقبـل منـه وهـو في الآخـرة مـن الخاسرين**"[٢٥] [واتە: هەرکەسێك دوای دینێك بکەوێت جگە لـە دینی ئیسلام ئەوە هـەرگیز لێی وەرناگیرێت، وە ئەو لـەڕۆژی دواییدا لـە زەرەرمەندانە].

وە نەکەی وشەی ئاین قەتیس بکەی تەنها لـە ئایینی دیان و جولـەکە و هاوشێوەی ئەمانە... جا شوێن ئاینی تـری گـومڕا بکـەوی وگـومڕا بـی... –زاراوەی ئـاین– گشـت ڕێبازێك یان شێوازێك یان ڕژێمێکی بەڕێوەبردن یـان قانونێـك لـە قانونـەکان کـە خـەڵکی شوێنی کەوتوون و ملکەچی بۆ دەکـەن... گشـت ئەمانـە دیـن و ئـاینن و بـەری بـوون و خۆلێپاراستنیان واجب و پێویستە... وە کوفر پێ کردنی و خۆپاراستن لە خاوەنـەکانیان – پێویست و واجبە–... جگە لـە ڕێبازی یەکتاپەرستی و ئایینی ئیسلام نەبێت... خوای گەورە فەرمانمان پێدەکات کە بە گشت کافرێك بە جیاوازی ڕێبازو ڕێچکەیان بڵێین:" **قـل يـا أيهـا الكافرون * لا أعبدُ ما تعبدون**..." تا دەگاتە:" **لكم دينكم ولي دين** " [واتە: بڵێ: ئەی بـێ بڕواینە* من هەرگیز ئەو شتانەناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن]... تا دەگاتە:( ئاینی خۆتان بـۆ خۆتان وە ئاینی خۆم بۆ خۆم)... جا هەر ڕێبازێك لـە ڕێبازەکانی کـوفر کۆبوونـەوە لەسـەر رژێم و شێوازێك کە پێچەوانەو دژی ئایینی ئیسلام بێت ئا ئەوە ئاینەکـەیتیان کـە پێـی ڕازی بوون... جا شیوعیەت و ئیشتراکیەت و عیلمانیەت و بەعسـیەت و هاوشـێوەی ئەمانـە لـە بیروباوەڕو ڕێبازی داهێنراو کە خەڵکی بە بیرە وەریوو بابردوەکانیان دایانهێناوەو پێـی ڕازی بوون کە دین و ئاین بێت بۆ خۆیان – ئەمانە گشتیان– دەچنە نێو –بازنەی ئایینـەوە–... وە

---

[٢٤] سورەتی (آل عمران) ئایەتی ١٩.

[٢٥] سورەتی (آل عمران) ئایەتی ٨٥.

لەوانەش ( دیموکراسیەت)ە، کە بەڕاستی ئەمەیان ئایینێکە جگە لە ئاینی خوای گەورە... وە ئەم چەند وشە ڕێکەوتە بۆتۆ لە ڕوونکردنەوەی گومڕایی ئـەم دینـە داهێنـراوەو دۆزراوەیـە کەوا زۆرێك لە خەڵکی بۆی شێت و شەیدا بوون، بگرە زۆرێك لەوانەی خۆیان دەگێڕنەوە بۆ ئیسلام، بۆ ئەوەی بزانی کە –دیموکراسیەت– ڕێبازێکە جگە لە ڕێبـازی یەکتاپەرسـتی و ڕێگەیەکە لە ڕێگە دەرچووەکان لە ڕێگەی (ڕاستەقینە)، کە لەسەر دەرگای هەر یـەکێکیان شەیتانێك وەستاوەو بانگەوازی دەکات بۆ ئاگر... بۆئـەوەی خـۆتی لێ دووربخەیـەوە... وە بانگی خەڵکی بکەی بۆ خۆ لێ دوورخستنەوەی... ئەمەش وەك...

بەبیرهێنانەوەیەك بۆ بڕواداران...

بەئاگاهێنانەوەیەك بۆ بێ خەبەرو بێ ئاگاکان...

نەهێشتنی بیانووی کەللەڕەقەکان...

داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگاری جیهانیان...

# بەشی

# دیموکراسی ئاینێکی کوفری داهێنراوە، وە دیموکراسیەکانیش لە نێوان چەند خوایەکی یاسادانەرو چەند شوێنکەوتەکیان دان کە دەیانپەرستن

بزانە کە بنچینەی ئەو وشە پیسە ( دیموکراسی) یۆنانیە و عەرەبی نیە... ئەویش بریتیە لە تێکەڵ کردن و کورتکراوەی دوو وشە، ( دیمۆس) واتە گەل. وە ( کراتۆس) واتە حوکم یان دەسەڵات یان یاسادانان... ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لێکدانەوەی وشەیی دەستەواژەی ( دیموکراسی) بریتیە لە :( حوکمی گەل)، یان ( دەسەڵاتی گەل) یان ( یاسادانانی گەل)..

ئەمەش بریتیە لە گەورەترین تایبەتمەندیەکانی دیموکراسی لای خاوەنەکانی... وە لە پێناویدا قسەدەکەن بە ستایش کردنی، ئەی موسوڵمانانی یەکتاپەرست ئەمە لە هەمان کاتدا لە تایبەتترین تایبەتمەندیەکانی کوفرو شیرك و ناڕەواییە کە بەتوندترین شێوە ئایینی ئیسلام و ڕێبازی یەکتاپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوەو بە توندرین شێوە بەربەرکانێی دەکات... لەبەرئەوەی لەوەی ڕۆیشت چاکت زانی کە بنچینەی بنچینەکان کە بونەوەر لە پێناویدا دروست کراوە، وە پەرتووکەکان دابەزێنراون، وە پێغەمبەران نێرراون، وە گەورەترین گرێش لە ئیسلامدا بریتیە لە یەکتاپەرستن بۆ خوای گەورەو خۆدوورخستنەوە لە پەرستنی جگە لەو... وە گوێڕایەڵی کردن لە یاسادانان لە پەرستنەکانە کە پێویستە تەنها بۆ خوا بێت، ئەگەر وانەبێت ئەو مرۆڤە موشریکەو لەگەڵ فەوتاوەکانە...

جا یەکسانە چ ئەو تایبەتمەندیە لە دیموکراسیدا لەسەر مانا ڕاستەقینەییەکەی جێبەجێکرا، کە بڕیار و حوکم بۆ کەسانێکی زۆر یان بۆ زۆرینەی گەل بوو، کە ئەمە بەرزترین خواستی دیموکراسیەکانە لە عیلمانیەکان یان ئەوانەی دەگێڕێنەوە بۆ دین..چ لەسەر ئەوەی کەلە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا هەیە ماوەو جێبەجێکرا، کە بریتیە لە فەرمانڕەوایی

کۆمەڵێك لە دەسەڵاتدارەکان و خزمە نزیکەکانیان لە خێزانەکانیان یان لە گەورە بازرگانەکان و (هەوامیر) دەوڵەمەندەکان کە سەرچاوەکانی ماڵ و سامان و هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیان بەدەستەو بەهۆیانەوە دەتوانن خۆیان یان ئەو کەسەی دەیانەوێ بیگەیەنن بە پەرلەمان ( تەلارو باڵەخانەی دیموکراسی)... هەروەك گەورەکەیان یان پەروەردگارەکەیان ( پاشا یان ئەمیر) لەهەر کاتێ و هەرچۆنێك بیەوێ دەتوانێ ئەو ئەنجوومەنە هەڵبوەشێنێتەوە یان بیبەستێ...

**جا دیموکراسیەت لە هەردوو ڕووەکەیەوە کوفرە بە خوای گەورەو شیرکە بە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویەکان، وە هەڵوەشێنەرەوەیە بۆ ڕێبازی یەکتاپەرستی و ئایینی پێغەمبەران...**

ئەمەش لەبەر چەندین هۆکاری جۆراوجۆر... لەوانە:-

یەکەم: چونکە دیموکراسی یاسا دانانی زۆرینەیە یان بڕیاری طاغوتە نەوەك بڕیاری خوای گەورە... جا خوا ( ناوهێنانی شکۆدار بێت) فەرمان بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات کە فەرمانڕەوایی بەوە بکات کە بۆی دابەزاندووە، وە لێی قەدەغە دەکات شوێن ئارەزووەکانی گەل یان زۆرینە یان میللەت بکەوێت، وە ئاگاداری دەکاتەوە لەوەی بە فیتنەی ببەن لە هەندێك لەو شتانەی کە خوا بۆی دابەرزاندووە، خوای گەورە دەفەرموێ:" **وأنِ احكم بينهم بما أنزل الله ولا تتبع أهواءهم واحذرهم أن يفتنوك عن بعض ما أنزل الله إليك**"[٢٦] [واتە: - وە فەرمانمان پێ کردی کە- حوکم و دادوەری لەنێوانیان بکە بەوەی کە خوا دایبەزاندووە، وە شوێن حەزو ئارەزووەکانیان نەکەوی، وە وریا بە لێیان لەوەی بتترازێنن لە هەندێك لەوەی خوا بۆی ناردویتە خوارەوە]... ئەمە لە ڕێبازی یەکتاپەرستی و ئایینی ئیسلام..

بەڵام لە ئایینی دیموکراسی و ڕێبازی شیرکدا بەندەکانی دەڵێن:(وە حوکم لە نێوانیان بکە بەوەی کە گەل پێی ڕازیەو وە شوێن ئارەزووەکانیان بکەوە، وە ئاگادار بە هەڵنەخەڵەتێنرێی لە هەندێ لەو شتانەی دەیانەوێ و حەزیان لێیەتی و دەیکەن بە یاسا)...

---

[٢٦] سورەتی (المائدە) ئایەتی ٤٩.

ئا ئاوا دەڵێن... وە ئاواش دیموکراسی دانی پێدادەنێ، ئەمەش کوفرێکی دیارو شیرکێکی ڕوونە ئەگەر جێبەجێی بکەن... لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەو بارودۆخەی تێیدان لەمەش بۆگەنترە، چونکە ئەگەر قسە لەسەر بارودۆخیان بکات ئەوە دەڵێ:( وە فەرمانڕەوایی لە نێوانیاندا بکە بەو شتەی کە طاغوت و کۆمەڵەکەی ئارەزوی دەکەن، وە نابێ هیچ یاساو قانونێك دابنرێ مەگەر پاش بەڕاست دانان و پەسەندکرنی ئەو نەبێ...)!!!

**هذا ضلالٌ مبينٌ واضحٌ أبداً بل هو الشركُ بالمعبودِ عُدواناً**

دووەم: چونکە دیموکراسی فەرمانڕەوایی زۆرینەیە یان هی طاغوتە، بەگوێرەی دەستوور نەوەك بەگوێرەی شەرعی خوای گەورە... بەم شێوە دەستوورو پەرتوکەکانیان وا دەڵێ[٢٧]، کەلە قورئان زیاتر ڕێزی دەگرن، بەبەڵگەی ئەوەی بڕیارەکەی لە بڕیاری قورئان لەپێشترە، وە شەرعەکەی دەسەڵاتدارە لەسەر شەرعی قورئان.. جا زۆرینە لە ئایینی دیموکراسیدا بڕیارو یاساکەی وەرناگیرێ – ئەوە ئەگەر بەشێوەیەکی کرداری فەرمانڕەوایی بکات– مەگەر لە دەقەکانی دەستوورەوە دەستی پێکردبێت و بەگوێرەی ماددەکانیشی بێت، چونکە لای ئەوان دەستوور باوکی هەموو قانوونەکانە و پەرتووکە بەڕێزەکەیەتی... وە لە ئایینی دیموکراسیدا بایەخ نادرێ بە ئایەتەکانی قورئان یان فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، وە ناکارێ یاسایەك یان قانونێك بەگوێرەیان دابنرێ مەگەر گونجاو بێت بۆ دەقەکانی پەرتووکە پیرۆزەکەیان ( دەستوور).. وە لەمە پرسیار لە زاناکانی!! قانون بکەن ئەگەر ئێوە لێی بە گومانن...

---

[٢٧] دەقی ماددەی ژمارە ٦ لە دەستووری کوێتی:( گەل سەرچاوەی گشت دەسەڵاتەکانە) و ماددەی ٥١ :( دەسەڵاتی یاسادانان ئەمیر و دانیشتگای گەل سەرپەرشتی دەکەن بەگوێرەی دەستوور)، وە دەقی ماددەی ٢٤ لە دەستووری ئوردنی :( گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەکانە) وە ( گەل پیشەگەری دەسەڵاتەکانی دەکات بەو شێوەیەی کە لەو دەستوورە ڕوون کراوەتەوە).

[ ماددەی ٥ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق:( سەروەری بۆ یاسایە، گەلیش سەرچاوەی دەسەڵات و شەرعیبونیەتی...).

ماددەی ٣ لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق:( گەل سەرچاوەی دەسەڵاتەو ڕەوا بونیەتی، کە لە ڕێگەی دامودەزگا دەستووریەکانەوە پیادەی دەکات...)].

خوا دەفەرموێ:" **فإنْ تنازعتم في شيءٍ فردّوه إلى الله والرسول إنْ كنتم تؤمنون بالله واليوم الآخر ذلك خيرٌ وأحسنُ تأويلاً**"[٢٨] [واتە: خۆ ئەگەر لە شتێكدا بوو بە كێشەتان، ئەوە بیگێرنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەرﷺ ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە باشترە وە ئاكام و ئەنجامی چاكترە].

وە ئایینی دیموكراسی دەڵێ:( ئەگەر لەسەر شتێك مشتومڕتان بوو ئەوە بۆ چارەسەركردنی بیگەڕێننەوە بۆ گەل و ئەنجومەنەكەی و پاشاكەی بەگوێرەی دەستوورە دانراوەكەو قانوونە زەمینیەكە)..!!

" **أُفٍّ لكم ولما تعبدون من دون ا لله أفلا تعقلون**"[٢٩] [واتە: ئۆف بۆ ئێوەو بۆ ئەو شتانەش كە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، دەی ئایا ژیر نابن – بیرو هۆشتان ناخەنە كار–؟].

وە لەسەر ئەم بنەمایە ئەگەر زۆرینە لە ڕێگای ئایینی ئەم دیموكراسیەوەو لە ڕێگای ئەنجومەنە شیركیە یاسادانەرەكەیەوە ویستی حوكم و فەرمانڕەوایی بە شەرعی خوای گەورە بكات.. ئەوە بۆی ناكرێ – ئەگەر طاغوت ڕێ پێبدات– مەگەر لە ڕێگای دەستوورو لە ڕێگای ماددەو دەقەكانیەوە نەبێ... چونكە دەستوور بریتیە لە پەرتووكە پیرۆزەكەی دیموكراسی یان بلێ تەورات و ئینجیلە گۆڕدراوەكەیەتی كە بە گوێرەی حەز و ئارەزووەكان –گۆڕدراوەو تێكدراوە–...

سێیەم: لەڕاستیدا دیموكراسی بەرهەمی عیلمانیەتە پیسەكەیەو كچە ناشەرعیەكەیەتی... چونكە عیلمانیەت ڕێڕەوێكی كوفریە پەل دەهاوێ بۆ دابڕینی دین و ئایین لە ژیان یان جیاكردنەوەی دین و ئایین لە دەوڵەت و حوكم و فەرمانڕەوایی...

وە دیموكراسی بریتیە لە حوكم و فەرمانڕەوایەتی گەل یان فەرمانڕەوایەتی طاغوت... بەڵام لە گشت بارودۆخێكدا حوكم و فەرمانڕەوایەتی خوای گەورەو بەرز نیە، ئەو هەروەك زانیت هیچ بایەخێك بۆ شەرعە قایم و پتەوو ڕێك و پێكەكەی خوای گەورە دانانێت، مەگەر پێش هەموو شتێك گونجاو بێت لەگەڵ ماددەكانی دەستوور، دووەمیشیان

---

[٢٨] سورەتی (النساء) ئایەتی ٥٩.

[٢٩] سورەتی (الأنبیاء) ئایەتی ٦٧. خوای گەورە لە قورانی پیرۆزدا پێی ڕاگەیاندووین كە بەڕاستی ئیبراهیم ئەمەی گوتووەتە گەلەكەی خۆی پاش ئەوەی گەمژەیی پەرستراوەكان و طاغوتەكانیانی بۆیان ڕوون كردەوە.

گونجاو بێت بۆ حەز و ئارەزووەکانی گەل، پێش گشت ئەمانەش خواستەکانی طاغوت یان کۆمەڵەکەی...

بۆیە ئەگەر گشت خەڵك و گەل بلێنە طاغوت یان پەروەردگارەکانی دیموکراسی: دەمانەوێ حوکم و فەرمانڕەوایی بەوە بکەین کە خوا داییەزاندووە، وە بەهیچ جۆرێك مافی یاسادانان بۆ هیچ کەس نابێت نە گەل و نە نوێنەری گەل لە ئەندامەکان و نە فەرمانڕەوا... وە دەمانەوێ بڕیاری خوا بەسەر هەڵگەڕاوەدا جێبەجێ بکەین وە بڕیاری خوا بەسەر زیناکەر و دزو مەی خۆردا...و... وە دەمانەوێ بالاپۆشی و پاکێتی بەسەر ئافرەتدا پێویست بکەین... وە خۆئارایشتکردن و خۆ ڕازاندنەوەو ڕوتی و کردەوەی ناشیاو ناشیرین و داوێن پیسی و زیناو نێربازی و کاری ناپەسەندی تری جگە لەمانە نەهێڵین... ئەوە یەکسەر پێی دەڵێن: ئەمە پێچەوانەی ئایینی دیموکراسی و ئازادیەکەیتی..!!!

کەواتە ئەوەیە ئازادی دیموکراسی: خۆئازاد کردن لە ئاینی خوا و یاساکانی و بەزاندنی سنوورەکەی.. بەلاّم یاسای دەستوورە زەمینیەکەو سنووری قانوونە دانراوەکە پارێزراو و پیرۆزو پاساوکراو و چاودێری کراوە لە دیموکراسیە پیس و بۆگەنەکەیان وە بگرە سزا دەدرێ هەرکەسێ پەلاماری بدات یان پێچەوانەی بکات یان هەڵیبوەشێنێتەوە...

**فتباً لكم تباً لكم تباً لكم    تباً لكم حتى يَكِلَّ لسانِ**

جا – موسوڵمانی یەکتاپەرست– کەواتە دیموکراسی... دین و ئایینێکە جگە لە دینی خوای گەورە... بەڕاستی حوکم و فەرمانڕەوایەتی طاغوتە نەوەك فەرمانڕەوایەتی خوای گەورە... بەڕاستی دەستوورو یاسایەکی چەند پەروەردگارێکی ڕێکنەکەوتوو و لەیەکترجیان و دەستوورو یاسای خوای تاك و بەهێزو بەتوانا نیە... وە ئەوەی لە خەڵکی قەبوڵی بکات و لەسەری ڕێك بکەوێت... ئەوە لەڕاستیدا قەبوڵی کردووە کە مافی یاسادانانی هەبێ بەگوێرەی ماددەکانی دەستوور، وە ئەو یاسایەی لەپێشتر بێت لە یاسای خوای تاك و بە توانا...

جا یەکسانە پاش ئەمە چ یاسا دابنێ یان نا، وە چ لە هەڵبژاردنەکان سەربکەوێ یان نا، چونکە ڕێککەوتنی لەگەڵ موشریکەکان لەسەر ئایینی دیموکراسیدا، وە قەبول کردنی ئەوەی بڕیارو یاسادانان بۆ ئەو بێ، وە ئەوەی کە دەسەڵاتەکەی لەسەرەوەی دەسەڵاتی

خوای گەورەو پەرتووکەکەی و یاساکەی بێت ئەوە بە خودی خۆی کوفرە، وە ئەمە هەمیشە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرایە، وە بگرە ئەوە شیرك و هاوبەشی دانانە بۆ پەرستراو–خوای گەورەی– بە شێوەیەکی زۆرداری و ڕقەبەرایەتیەوە.

جا لە ئایینی دیموکراسیدا گەڵ ئەو ئەندامانە دەکاتە نوێنەر لە جیاتی خۆی، جا هەر گروپێك یان کۆمەڵێك یان هۆزێکیان خوایەك لەو خوایە جیاوازانە بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ، بۆ ئەوەی یاسایان بۆ دابڕێژن بەگوێرەی حەز و ئارەزو خواستەکانیان... بەڵام هەروەك زانراوە: بەگوێرەی دەق و ماددەکانی دەستوور و لە سنوورەکەیدا... جا لە نێویاندا هەیە پەرستراوەکەو یاسادانەرەکەی هەڵدەبژێرێ بەگوێرەی بیرو ئایدۆلوجیاکەی... جا یان پەروەردگارێکە لە حیزبی فڵانی... یان خوایەکە لە حیزبی عەلانی... وە لە نێویاندا هەیە کە بەگوێرەی هۆزگەرایی و خزمایەتیەوە هەڵدەبژێرێت... جا یان خوایەکە لە هۆزی فڵانی... یان بتێکی پەرستراوە لە هۆزی عەلانی... وە لە نێویاندا هەیە کە بە نیازی خۆیان خوایەکی سەلەفی هەڵدەبژێرن، وە یەکێکی تر دەیکاتە خوایەکی برایان ( إخواني) [٣٠]...یان پەرستراوێکی ڕیشدار وە ئەوەی تر ڕیش تاشراو... ئا بەم شێوەیە..." **أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله ولولا كلمة الفصل لقضيَ بينهم وإن الظالمين لهم عذاب أليم** "[٣١] واتە:[ ئاخۆ –ئەو بێ باوەڕانە– هاوبەشانێکیان هەیە، کە بەرنامەو ئاینێکیان بۆ داناون کە خوا ڕێگەی پێ نەداوە، وە ئەگەر بڕیاری یەکجارەکی دەرنەچوایە لە نێوانیاندا بڕیار دەردەکرا –بە لەناو بردنیان–، بەڕاستی بۆ ستەمکاران سزای سەختی ئازاردەر هەیە].

جا ئەو ئەندام پەرلەمانانە لە ڕاستیدا چەند بتێکی دانراوو پەیکەرێکی پەرستراوو خوایەکی وتراوو بێ متمانەی دانراون لە پەرستگاو قەڵاکانی بتپەرستیان ( پەرلەمان) دینداری دەکەن خۆیان و شوێنکەوتوانیان بە دینی دیموکراسی و یاسای دەستوور، فەرمانڕەوایی بۆ دەگێڕنەوەو بەگوێرەی دەق و ماددەکانی یاساو قانون دادەنێن... وە پێش هەموو ئەمانە پەروەردگارەکەو خواکەو پەیکەرەکە یان بتە گەورەکەیان فەرمانڕەواییان

---

[٣٠] ئەمە هەمووی بەو پەڕی داخەوە ڕوویداوەو بوونی هەیە لە کوێت... وە لە زۆر وڵاتاندا...

[٣١] سورەتی (الشوری) ئایەتی ٢١.

دەکات کە دان دەنێ بەو یاسایانەیان وە پەسندی دەکات یان بەرپەرچی دەداتەوەو ڕەتی دەکاتەوە... ئەوەش ئەمیر یان پاشا یان سەرۆکەکەیە...

ئەی موسوڵمانی یەکتاپەرست ئەوەیە ناوەڕۆك و ناواخنی دیموکراسی و ڕێبازەکەی... دین و ئایینی طاغوت... نەوەك ئایینی خوا... وە ڕێبازی موشریکان... نەوەك ڕێبازی پێغەمبەران... وە شەرع و یاسای چەند پەروەردگارو خوایەکی جیاوازو نارێك و ناکۆك... نەوەك شەرع و یاسای خوای تاك و بەهێزو بەتوانا...

**" ءَأربابٌ متفرقون خيرٌ أمِ الله الواحد القهار * ما تعبدون من دونه إلا أسماءً سميتموها أنتم وأباؤكم ما أنزل الله بها من سلطان"**[٣٢] [واتە: ئایا چەند خوایەکی جیا جیا باشترن یان خوایەکی تاکی بە دەسەڵات* ئێوە بێجگە لە خوا هیچ شتێك ناپەرستن جگە لە چەند ناوێك نەبێت کە ئێوەو باو باپیرانتان ناوتان لێناون، خوا هیچ بەڵگەیەکی دەربارەیان نەناردۆتە خوارەوە].

**" ءَإلهٌ مع الله؟؟ تعالى الله عما يشركون"**[٣٣] [واتە: ئایا هیچ پەرستراوێك هەیە لەگەڵ خوادا؟؟ خوا بەرزو بڵندترە لەوەی بتپەرستان دەیکەنە هاوبەشی].

جا ئەی بەندی خوا هەڵبژێرە... یان دینی خوا و شەرعە پاکەکەی و چرا ڕوناکەکەی و ڕێگا ڕاستەکەی... یان دینی دیموکراسی و شیرکەکەو کوفرەکەی و ڕێگا خوارو داخراوەکەی... حوکم و فەرمانڕەوایی خوای تاکی بە دەسەڵات... یان حوکم و فەرمانڕەوایی طاغوت...

**" قد تبين الرشد من الغي فمن يكفر بالطاغوت ويؤمن بالله فقد استمسك بالعروة الوثقى لا انفصام لها..."**[٣٤].[واتە:( بەڕاستی لەیەك جیا بوونەتەوە ڕێنمویی و شارەزایی لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی کوفر بە طاغوت بکات و باوەڕیش بە خوا بهێنێ، ئەوە بێگومان بە توندی دەستی گرتووە بە بەهێزترین گرێوە، کە پچڕان و بەربوونی بۆ نیە] **" وقلِ**

---

[٣٢] سورەتی (یوسف) هەردوو ئایەتی ٣٩-٤٠.

[٣٣] سورەتی (النمل) ئایەتی ٦٣.

[٣٤] سورەتی (البقرة) ئایەتی ٢٥٦.

**الحق من ربّكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر إنا أعتدنا للظالمين ناراً...**"[٣٥] [واتە: وە بڵێ: حەق – ئەم قورئانە– لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان هاتووە، جا هەرکەسێ دەیەوێت با باوەڕ بێنێ وە هەرکەسیش دەیەوێت با کافر بێت، بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران ئاگرێك...]

"**أفغير دين الله يبغون وله أسلم من في السموات والأرض طوعاً وكرهاً وإليه يرجعون * قل آمنا بالله وما أنزل علينا وما أنزل على إبراهيم وإسماعيل وإسحق ويعقوب والأسباط وما أوتي موسى وعيسى والنبيون من ربهم لا نفرّق بين أحد منهم ونحن له مسلمــون * ومن يبتغ غير الإسلام ديناً فلن يُقبل منه وهو في الآخرة من الخاسرين**"[٣٦] [واتە: ئایا –بێ بڕوایان– داوای غەیری دینی خوا دەکەن؟ لە کاتێکدا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە فەرمانبەری خوان بیانەوێ – بە ویستی خۆیان– یان نەیانەوێ – بە ناچاری–، وە هەموو هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە * – ئەی موحەممەد، ئەی بڕوادار– بڵێ: بڕوامان هێناوە بە خوا وە بەوەی بۆمان نێرراوەتە خوارەوە وە بەوەی کە نێرراوەتە خوارەوە بۆ سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕانی یەعقوب و بەوەی کە دراوە بە موسا و عیسا وە پێغەمبەرەکانی تر لە پەروەردگاریانەوە، جیاوازی لە نێوان هیچ کامێکیان ناکەین و ئێمە بۆ خوای گەورە گەردن کەچین* هەرکەسێ دوای دینێك بکەوێت جگە لە دینی ئیسلام ئەوە هەرگیز لێی وەرناگیرێت، وە ئەو لەڕۆژی دواییدا لە زەرەرمەندانە].

---

[٣٥] سورەتی (الكهف) ئایەتی ٢٩.

[٣٦] سورەتی (آل عمران) ئایەتەکانی ٨٣–٨٥.

# بەشی
# بەرپەرچدانەوەی گومانەکان و بەڵگە درۆینەکان کە ڕێ بە ئایینی دیموکراسی دەدات

خوای گەورە دەفەرموێ:" **هو الذي أنزل عليك الكتاب منه آيات محكمات هن أم الكتاب وأُخر مُتشابهات فأما الذين في قلوبهم زيغٌ فيتبعون ما تشابه منه ابتغاء الفتنة وابتغاء تأويله وما يعلم تأويله إلا الله والراسخون في العلم يقولون آمنا به كلٌّ من عند ربِّنا وما يذكر إلا أُولو الألباب * ربنا لا تزغ قلوبنا بعد إذ هديتنا وهب لنا من لدنك رحمة إنك أنت الوهاب**"[٣٧] [واتە: ئەو خوایە قورئانی بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، هەندێکی ئایاتی ڕۆشنن، ئەو ئایەتانە بنەڕەتی قورئانن، وە ئەوانی تر –ئایەتانێکن کە مەبەستەکانیان– ڕۆشن نین، ئینجا ئەوانەی لە دڵیاندا لادان و چەوتی هەیە، دوای ئەو ئایەتانە دەکەون کە لە قورئان موتەشابیهن –هاوشێوەن– بۆ تێکدانی بیرو باوەڕی موسوڵمانان وە بۆ ڕاڤەکردنی بە ئارەزوی ناپاکی خۆیان، لە کاتێکدا کەس ڕاڤەکردنی ئەو ئایەتانە بەتەواوی نازانێت تەنها خوا نەبێت، وە دامەزراوان لە زانیندا دەڵێن: ئێمە بڕوامان هێناوە بە –متشابە– هەمووی لە پەروەردگارمانەوەن، وە بیر لە قورئان ناکەنەوە تەنها خاوەنانی ژیری و بیر نەبێ * دەڵێن ئەی پەروەردگارمان دوای ئەوەی کە ڕێنموییت کردین، دڵەکانمان لامەدە لە ( ڕێگەی ڕاست) وە لەلای خۆتەوە بەزەییەك –میهرەبانیەك–مان پێ ببەخشە، بەڕاستی هەر تۆی بەخشندە].

خوای گەورە لەم ئایەتانەدا بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە خەڵکی لەبەرامبەر ڕێبازو بەرنامەکەی دوو بەشن:

١– خاوەن زانست و تێگەیشتوو و دامەزراوەکان: وەری دەگرن و بڕوا بە گشتی دەهێنن، –دەقە– گشتیەکان بە تایبەتەکان دەبەستنەوە، وە ڕەهاکانیش بە

---

[٣٧] سورەتی (آل عمران) هەردوو ئایەتی ٧–٨.

کۆتکراوەکان، وە کورتکراوەکان بە ڕوونەکان، وە هەر شتێك لایان کێشەی لەسەر هەبوو، ئەوە دەیگێڕنەوە بۆ دایکەکەی لە بنچینە قایم و پتەوە ڕوونەکان و ڕێسا جێگیرو چەسپیوەکان کە بەڵگە شەرعیەکان لەسەری پشتگیری یەکتری دەکەن.

٢- لەڕاست و لەڕێ لادراوو گومڕاکان: شوێن چوونیەکەکان دەکەون، دەستی پێوەدەگرن و بەتەنها پێی دڵخۆش دەبن لەپێناو ئاشوب و فیتنەدا.. پشتیانکردووە لە -دەقە- قایم و پتەوەکان یان ڕوونەکەی یان لێکدراوەکەی -تەفسیرکراوەکەی-...

ئا لێرەدا... لە باسی دیموکراسی و ئەنجوومەنە نوێنەرایەتیە شیرکیەکەی و هاوشێوەکانی... ئەو گەلە ڕێگای لەڕاستەڕێ لادراوەکان و گومڕاکان دەگرنەبەرو شوێن بەسەرهات و چەند گومانێك دەکەون و بەتەنها وەری دەگرن، بەبێ ئەوەی بیبەستنەوە بە بە بنچینە ڕوونکەرەوەکان یان کۆتکراوەکان یان ڕاڤەکراوەکان لە ڕێساکانی دین و بنچینە جێگیرەکانی... ئەمەش بۆ ئەوەی حەق و ڕاستی بپۆشن بە درۆو ڕووناکیش بە تاریکی...

بۆیە، لەم باسەدا بە خێرایی بەرەنگاری دیارترین گومانەکانیان دەبینەوە، دواتر بەرپەرچیان دەدەینەوەو پۆچەڵیان دەکەینەوەو وەڵامیان دەدەینەوە بە یارمەتی پاشای بەخشەرو پاڵنەری هەورەکان و شکێنەرو بەزێنەری حیزبەکان.

# گومانی یەکەم

# کاری پێغەمبەر یوسف لای پاشای میصرو وەڵامەکەی

چاك بزانە ئەم گومانە هەندێك لەوانەی مایەپووچ و دەست بەتاڵن لە بەڵگەکان خۆیان پێوە بەستۆتەوە...

جا دەڵێن: ئایا یوسف – سەلامی خوای لێبێ- پلەی وەزارەتی نەگرتە ئەستۆ لای پادشایەکی کافر کە فەرمانڕەوایی بەوە ناکات کە خوای گەورە دایبەزاندووە؟ کەواتە بەشداری کردن لە حوکومەتە کافرەکان ڕێگەپێدراوەو بگرە چوونە ناو پەرلەمان و ئەنجوومەنی گەل و هاوشێوەکانیشی –ڕێگەپێدراوە-.

-لە وەڵامدا- دەڵێین وە تەوفیقیش لای خوایە:

یەکەم: بەڕاستی بەڵگە هێنانەوە بەو گومانە لەسەر چوونە ناو پەرلەمانەکانی یاسادانان و ڕێگەپێدانی نارەواو پووچەڵە، چونکە ئەو پەرلەمانە شیرکیانە لەسەر ئایینێك جگە لە ئایینی خوای گەورە وەستاون و دامەزراون ئەویش بریتیە لە ئایینی دیموکراسی کە خوایەتی یاسادانان و حەڵاڵ کردن و حەرام کردن تیایدا بۆ گەلە نەوەك بۆ خوا بە تەنهایی..

وە خوای گەورەش دەفەرموێ:" **ومن يبتغِ غير الإسلام ديناً فلن يُقبل منه وهو في الآخرة من الخاسرين**"[٣٨] [واتە: هەرکەسێك دوای دینێك بکەوێ جگە لە دینی ئیسلام ئەوە هەرگیز لێی وەرناگیرێ وە ئەو لەڕۆژی دوایدا لە زەرەرمەندیدان]. جا کەسێك دەوێرێ گومان ببات کە بڵێ یوسف – سەلامی خوای لێبێ- شوێن ئاینێك کەوتووە جگە لە ئاینی ئیسلام یان ڕێبازێك جگە لە ڕێبازی باووباپیرانی یەکتاپەرستی.. یان سوێندی خواردووە

---

(٣٨) سورەتی (آل عمران) ئایەتی ٨٥.

لەسەر ڕێزگرتنی..؟؟ یان بەگوێرەی ئەو یاسای دانابیٚ..؟؟ هەروەك ئەمە بارودۆخی ئەوانەیە کە شەیدای ئەو جۆرە پەرلەمانانە بوون[٣٩]..؟؟

چۆن وایە کاتیٚ یوسف – سەلامی خوای لیٚبیٚ– لەکاتی بێدەسەلاٚتیدا بە ئاشکرا ڕایدەگەیەنیٚ و دەلٚیٚ:" **إني تركتُ ملّة قومٍ لا يُؤمنون بالله وهم بالآخرة هم كافرون * واتبعتُ ملّة ءاباءي إبراهيم وإسحق ويعقوب ما كان لنا أن نشرك بالله من شيء**"[٤٠] [واتە: بەڕاستی من وازم هێناوە لە ئاینی گەلێك کە بڕوا بە خوا ناهێنن هەروەها ئەوان بیٚ بڕواش بوون بە ڕۆژی دوایی* وە شوێن ئایینی باوو باپیرانم کەوتووم کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبن، هەرگیز بۆ ئێمە ڕەواو شیاو نیە کە هیچ شتێك بکەین بە هاوبەش و شەریك بۆ خوا].

هەروەها دەلٚیٚ:" **يا صاحبيَ السّجن ءأربابٌ مُّتفرقون خيرٌ أمِ الله الواحد القهار * ما تعبدون من دونه إلا أسماءً سمَّيتموها أنتم وءاباؤُكم ما أنزل الله بها من سلطان إنِ الحكمُ إلالله أمر ألاَّ تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيم ولكنَّ أكثر الناس لا يعلمون**"[٤١] [واتە: ئەی دوو هاوەلٚەکەی بەندیخانەم ئایا چەند خوایەکی جیا جیا باشترن یان خوایەکی تاکی بە دەسەلاٚت* ئێوە بێجگە لە خوا هیچ شتێك ناپەرستن جگە لە چەند ناوێك نەبێت کە ئێوەو باو باپیرانتان ناوتان لێناون، خوا هیچ بەلٚگەیەکی دەربارەیان نەناردۆتە خوارەوە، بێگومان بڕیار تەنها بۆ خوایە، فەرمانی داوە بێجگە لەو هیچ شتێك نەپەرستن، ئەوەیە ئاینی ڕاستی دامەزراوی نەگۆڕاو، بەلاٚم زۆربەی خەلٚکی نازانن].

---

[٣٩] کەوا دەستوورەکانیان دەلٚیٚ میللەت یان گەل سەرچاوەی دەسەلاٚتەکانە ( بڕوانە ماددەی ژمارە ٦ لە دەستووری کوێتی و ماددەی ژمارە ٢٤ لە دەستوری ئوردنی، [ وە ماددەی ٥ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق، وە هەروەها ماددەی ٣ لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق]) وە دەسەلاٚتی یاسادانان بە پاشا یان ئەمیر یان بە ئەنجوومەنی گەلەوە دەبەستریٚ ( بڕوانە ماددەی ژمارە ٥١ لە دەستووری کوێتی و ماددەی ژمارە ٢٥ لە دەستووری ئوردنی [ وە ماددەکانی ٦١ و ٧٣ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق، وە هەروەها ماددەکانی ٤٠ و ٥٣ و ٥٤ لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق] ).

[٤٠] سورەتی (یوسف) هەردوو ئایەتی ٣٧–٣٨.

[٤١] سورەتی (یوسف) هەردوو ئایەتی ٣٩–٤٠.

**ئايا يوسف – سەلامی خوای لێبێ– ڕایدەگەیەنێ و دەیدرکێنێ و بانگەوازی بۆ دەکات وە بێدەسەڵاتیشە... دواتر پاش پایەداری و دەسەڵات دەیشارێتەوە یان هەڵی دەوەشێننەوە..؟؟!!**

**وەڵامان بدەنەوە ئەی ئەوانەی – شتەکان تەنها بەگوێرەی بیروبۆچوونی خۆتان– بەچاك و باش دەزانن..!!**

**جا ئایا ئێوە نازانن ئەی پڕ سیاسەتەکان کە وەزارەت دەسەڵاتی جێبەجێکردنەو پەرلەمانیش دەسەڵاتی یاسادانان.. لە نێوان ئەم دوانەشدا جیاوازی هەیە، چەندین جیاوازی، بۆیە ئا لێرەدا بەراوردکرن و قیاسکردنی ئەمە دروست نیە لای ئەوانەی ئەمە دەڵێن – و باوەڕیان بە قیاس هەیە– (٤٢)... وە لەمەوە دەزانی کە بەبەڵگە هێنانەوەی بەسەرهاتی یوسف**

---

(٤٢) هەندێك وا دەبینن کە وەزارەت ترسناکترە لە پەرلەمان، ئەمەش لەوەوە کە پەرلەمان بە گومانی خۆیان بەرەیەکی دژە بۆ حوکومەت، جا ئەوان لەو بەرەیەوە جیهاد دەکەن، جیهادێکی دەستووری، وە خەبات دەکەن تیایدا، خەباتێکی یاسایی، وەتێدەکۆشن، تێکۆشانێکی دیبلۆماسی.. وە نابیناو کوێر بوون کە یاسادانان خراپیەکەی ترسناکترە لە جێبەجێکردن، بە تایبەتی ئەو یاسایەیان کە ناویان ناوە بە جیهاد و تێکۆشان لە پەرلەمان نابێ مەگەر بە گوێرەی دەستوور نەبێت وە چوونیەك نەبێ بۆ ئایینی دیموکراسیەت، بڕوانە ماددەی ٢٤ لقی ٢ لە دەستووری ئوردنی کەتیایدا دەسەڵاتەکانی یاسادانانی گەل یان دەسەڵاتی تر ئەنجام نادرێ مەگەر بەو شێوە نەبێ کە لە دەستوور ڕوونکراوەتەوە.. وە بە گومانی ئەوان ئەندام پەرلەمانەکانیش هیچ نین جگە لەوەی نوێنەری گەلن کە خاوەن دەسەڵاتەکانی دەستووریە!! وە بڕوانە خوشکە نا شەرعیەکەی لە دەستووری کوێتی ماددەی ژمارە ٥١ ( دەسەڵاتی یاسادانان ئەمیرو ئەنجومەنی گەل سەرپەرشتی دەکەن بە گوێرەی دەستوور [ ماددەی ٦١ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق:( ئەنجومەنی نوێنەران ئەم کارانەی خوارەوەی لە ئەستۆ دایە: یەکەم: دانانی یاسا فیدراڵیەکان)، وە هەروەها ماددەی ٧٣ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق:( سەرەك کۆمار ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوەی هەیە: ... سێیەم: پەسەندکردن و دەرکردنی ئەو یاسایانەی ئەنجومەنی نوێنەران دایدەنێن، یاساکانیش بە پەسندکراو دەژمێردرێن پاش تێپەڕبوونی ١٥ ڕۆژ بەسەر ناردنیان بۆ سەرۆك کۆمار). وە ماددەی ٤٠ لە پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق:( پەرلەمانی کوردستان–عێراق دەسەڵاتی یاسادانان و سەرچاوەی بڕیاردانە لەسەر پرسە چارەنووس سازەکانی گەلی هەرێمی کوردستان)، وە ماددەی ٥٣ لە پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق:( پەرلەمان بێجگە لەو ئەرکانەی بەپێی یاسا کارپێکراوەکانی هەرێم پێی دەسپێردرێن ئەم ئەرکانەشی لەسەر شانە: ... سێیەم: ١– دانانی یاسا لە هەرێمی کوردستان...)، وە هەروەها ماددەی ٥٤ لە پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق:( بەدەر لەو حوکمی بڕگەی (حەوتەم)ی ماددەی (٦٥)، کە لەم دەستوورەدا هاتووە، پەرلەمان بۆی نیە واز لە دەسەڵاتەکانی یاسادانانی خۆی بێنێ)]).

– سەلامی خوای لێبێ– لەسەر ڕێگەپێدانی پەرلەمانەکان بەهیچ جۆرێك دروست نیە، وە هیچ بەربەستێکیش نیە ئەگەر بەردەوام بین لە پوچەڵ کردنەوەی بەڵگە هێنانەوەکەیان بە – چیرۆکی یوسف – سەلامی خوای لێبێ– لەسەر وەزارەت –ڕەوایی گرتنە ئەستۆ– لەبەر هاوبەشی هەردوو پۆستەکە لە کوفردا لە سەردەمی ئێمەدا..

دووەم: بەڕاستی پێچواندن و بەراوردکرنی گرتنە ئەستۆی زۆرێك لە شەیدایانی وەزارەت لە سێبەری ئەو دەوڵەتە طاغوتیانە کە یاسادادەنێن لەگەڵ خوا وە شەڕی ئەولیاکانی خوا دەکەن وە لایەنگری دوژمنانی دەکەن لەسەر کاری یوسف –سەلامی خوای لێبێ– بەراوردو لێکچواندنێکی نارەوا و پووچەڵە لەچەند ڕویەکەوە:–

١– بێگومان ئەوەی وەزارەتی گرتۆتە ئەستۆ لە سێبەری ئەو حوکومەتانەدا کە فەرمانڕەوایی دەکەن بە جگە لەوەی خوای گەورە ناردویتیە خوارەوە هیچ چارەیەکی نیە دەبێ ڕێزی دەستورە دانراوەکەیان بگرێ وە ملکەچ بێت بە پشتگیری و دڵسۆزی بۆ طاغوت کە خوا لەیەکەم ئەو فەرمانانەی کردویەتی فەرمانی پێ کردووە کە کوفری پێ بکات:" **یُریدون أن یتحاکموا إلی الطاغوت وقد أمِروا أن یکفروا به**"[٤٣] [واتە: دەیانەوێت حوکم و دادوەری بەرن بۆ لای طاغوت، لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێکراوە کوفری پێ بکەن].

وە بگرە لای ئەوانە دەبێ ئەو سوێندە هەر بخورێ لەسەر ئەو کوفرە پێش گرتنە ئەستۆی ئەو کارە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، تەواو وەك بارودۆخی ئەندام پەرلەمان[٤٤]. وە

---

[٤٣] سورەتی (النساء) ئایەتی ٦٠.

[٤٤] ماددەی ٣٤ لە دەستووری ئوردنی دەڵێ:( لەسەر سەرۆکی وەزیران و وەزیرەکان پێویستە کەوا لەبەرامبەر پاشا پێش دەستپێکردنی کارەکانیان ئەم سوێندە بخۆن: سوێند بە خوای گەورە دەخۆم کە دڵسۆز بم بۆ پاشا، وە پارێزگاری لە دەستوور بکەم... هتد) [ وە ماددەی ٥٠ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق:( ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران سوێندی دەستووری دەخوات لەبەردەم ئەنجومەندا پێش دەست بەکار بوون بەم شێوەیەی خوارەوە:( سوێند بێت بە خوای گەورەو مەزن، ئەرك و بەرپرسیاریەتی یاساییم بە لێبڕاوانەو دڵسۆزانە جێبەجێبکەم و پارێزگاری لە سەربەخۆیی و سەروەری عێراق بکەم و بەرژەوەندی گەلەکەی لەبەر چاو بگرم و شەونخونی بکەم بۆ سەلامەتی زەوی و ئاسمان و ئاوو سامان و ڕژێمە دیموکراتیی و فیدراڵیەکەی وکار بکەم بۆ پارێزگاری لە ئازادیە گشتی و تایبەتیەکان و سەربەخۆیی دادگاو پابەند بوون بە جێبەجێکردنی یاساکان بە ئەمانەت و بێلایەنیەوە،

ئەوەی پێی وابێ کە یوسفی ڕاستگۆ و بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێز ئاوا بووە وە پاش ئەوەی خوای گەورە پاکانەی کردووەو لەبارەیەوە فەرمویەتی:" **كذلك لنصرف عنه السوء والفحشاء إنه من عبادنا المخلصين**"(٤٥) [واتە: ئا بەو جۆرە –بەڵگەمان نیشان دا– بۆ ئەوەی خراپەو داوێن پیسی لێ دوور بخەینەوە، بەڕاستی ئەو –یوسف– لە بەندە پاك و

---

خواش شایەتی ئەوەیەکە دەیڵێم))، وە ماددەی ٤٤ لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق:( ئەندامانی پەرلەمان، پێش دەست بەکاربوونی، ئەم سوێندە دەستووریە دەخوا:( بە خودای گەورە سوێند دەخۆم کە بەرژەوەندی گەلی هەرێمی کوردستان و یەکێتی و کەرامەت و ماف و ئازادیەکانی هاوڵاتیان و سامانی گشتی بپارێزم و پابەندی حوکمەکانی دەستوور بم و ئەرکی ئەندمەتی بەڕاستی و دڵسۆزیەوە ئەنجام بدەم))] وە هاوشێوەکەی ماددەی ٧٩:( لەسەر هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی هەردوو ئەنجومەنی پیاوماقوڵان و نوێنەران پێش دەستکردن بە کارەکانیان لەپێش ئەنجومەنەکەی سوێندێك بخوا کە ئەمە دەقەکەیەتی: **سوێند بە خوای گەورە دەخۆم کە دڵسۆز بم بۆ پاشا و نیشتیمان وە پارێزگاری لە دەستوور بکەم...هتد**) وە هاوشێوەکەشی لە دەستووری کوێتی هەردوو ماددەی ١٢٦ و ٩١ [ وە ماددەی ٧٩ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق:( سەرۆك و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران لەبەردەم ئەنجومەنی نوێنەراندا سوێندی دەستووری دەخۆن بەو شێوەیەی لە ماددەی (٥٠)ی دەستووردا هاتووە). ماددەی ٥٠ لە هەمان دەستووردا:( سوێند بێت بە خوای گەورەو مەزن، ئەرك و بەرپرسیاریەتی یاساییم بە لێبڕاوانەو دڵسۆزانە جێبەجێبکەم و پارێزگاری لە سەربەخۆیی و سەروەری عێراق بکەم و بەرژەوەندی گەلەکەی لەبەر چاو بگرم و شەونخونی بکەم بۆ سەلامەتی زەوی و ئاسمان و ئاوو سامان و ڕژێمە دیموکراتیی و فیدراڵیەکەی وکار بکەم بۆ پارێزگاری لە ئازادیە گشتی و تایبەتیەکان و سەربەخۆیی دادگاو پابەند بوون بە جێبەجێکردنی یاساکان بە ئەمانەت و بێلایەنیەوە، خواش شایەتی ئەوەیەکە دەیڵێم). وە ماددەی ٧١ لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق:( سەرۆك و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران دوای وەرگرتنی متمانەو پێش دەست پێکردنی کارە فەرمیەکانیان لەبەردەم پەرلەمان ئەم سوێندە دەخۆن:( بە خودای گەورە سوێند دەخۆم کە بەدڵسۆزیەوە یەکێتی گەل و خاکی کوردستان–عێراق بپارێزم، و ڕێز لە دەستوورو یاسا بەرکارەکان بگرم و سامانی گشتی بپارێزم و بەتەواوی چاودێری بەرژەوەندیەکانی گەل بکەم))].

**جا ئایا یوسف سەلامی خوای لێبێ شتێکی لەم جۆرەی کرد؟؟؟؟**

وە نەخەڵەتێی و فریونەخۆی بە داپۆشینی هەندێك لە بە فیتنە چوون کە دەڵێن: سوێند دەخۆین وە لە دڵیشمان بێجگە دەکەین:( لە سنووری شەرعدا). پێیان بڵێ: سوێند لەسەر نیازو نیەتی سوێند خۆر نیە، ئەگەر کار وابوایە ئەوە گرێبەستەکانی خەڵك و مەرجەکانیان هەموی پوچەڵ دەبویەوە وە دەرگا بۆ هەموو گەمەکەرێك دەبۆوە، بەڵام هەروەك هەڵبژێردراو ﷺ لەو فەرموودەیەی موسلیم گێڕاویەتەوە دەفەرموێ:" اليمين على نية المستحلف " واتە:( سوێند لەسەر نیازو نیەتی سوێند دەرە). بۆیە ئەو سوێندانەتان شوێن نیازەکانتان ناکەوێ، بەڵکو لەسەر نیازی طاغوتەکەیە کە سوێندی داون...

(٤٥) سورەتی (یوسف) ئایەتی ٢٤.

هەڵبژاردەکانی ئێمەیە]. ئا ئەوە بێ بڕواترین و کافرترینی بونەوەرەو بۆگەنترینیانە، بەڕاستی خۆی بەری کردووە لە ڕێبازو میللەتی ئیسلام و لە ئایین لایداوە، بگرە لە ئیبلیسی نەفرەتیش خراپترە کاتێ کە سوێندی خواردو بێجگەی کرد " **فبعزتك لأغوينهم أجمعين إلا عبادك منهم المخلصـين**"[٤٦] [واتە: -شەیتان- وتی سوێند بە عیززەتت هەر هەموویان گومڕا دەکەم، ئەوانەیان نەبێ کە بەندەی پاك و هەڵبژاردەی تۆن].

وە یوسف -سەلامی خوای لێبێ- بەدڵنیاییەوە بە دەقی فەرموودەی خوای گەورە لە بەندە دڵسۆزەکانە، بگرە لە گەورەکانیانە...

٢- بێگومان ئەوانەی لەژێر سێبەری ئەو حکومەتانەدا وەزارەتیان گرتۆتە ئەستۆ - سوێندی دەستوریان خواردبێ یان نا- هەردەبێ ملکەچ بێ بۆ یاسا کوفریە دانراوەکە وە لێی دەرنەچێ یان سەرپێچی بکات، ئەو هیچ نیە تەنها بەندەیەکی دڵسۆزە بۆی وە خزمەتکارو گوێڕایەڵە بۆ دانەرەکانی لە ڕاستی و نارەوایی و کاری خراپەو ستەم و کوفردا..

جا ئایا یوسفی ڕاستگۆ وابوو، تاوەکو کاری ئەو بگونجێ بۆ بەڵگەهێنانەوە بۆ ڕەواکردنی پایەو کارەکانی ئەو گەلە کوفریە..؟؟ بەڕاستی ئەوەی تانە بە شتێك لەو شتانە لە پێغەمبەری خوا کوڕی پێغەمبەری خوا کوڕی پێغەمبەری خوا کوڕی خۆشەویستی خوا بدا، ئەوە هیچ گومانمان لە کوفرو زەندەقەو دەرچوونی ئەو کەسە نیە لە ئیسلام.. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ:" **ولقد بعثنا في كلِّ أمةٍ رسولاً أنِ اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت**"[٤٧] [واتە:( سوێند بە خوا ئێمە لەناو هەر گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی تەنها خوا بپەرستن و دوور کەونەوە لە -پەرستنی- هەر پەرستراوێکی تر]. جا ئەوە بنچینەی بنچینەکانە وە گەورەترین بەرژەوەندیە لە بووندا لای یوسف و -سەلامی خوای لێبێ- هەموو پێغەمبەرکانی تری خوا..

---

[٤٦] سورەتی (ص) هەردوو ئایەتی ٨٢-٨٣.

[٤٧] سورەتی (النحل) ئایەتی ٣٦.

جا ئایا دەچێتە عەقل کە لە ناخۆشی و خۆشیدا وە لە بێ هێزی و بێ تواناییدا بانگی خەڵکی بۆ بکات، پاشان هەر خۆی هەڵی بوەشێنێتەوەو بیڕوخێنێ، ببێتە یەکێك لە موشریکەکان؟؟ چۆن وا دەبێ کاتێ خوا باسی دەکات کە ئەو لە بەندە دڵسۆزەکانی خوایە؟؟ وە لەڕاستیدا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان باسیان کردووە ئەو فەرموودەی خوای گەورە:" **ما كان ليأخذ أخاه في دين الملك...** "[٤٨] [واتە: نەدەبوو بە ئایین و دەستووری پاشاکە براکەی گل بداتەوەو بیگرێ...]. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی یوسف –سەلامی خوای لێبێ– نیزام و قانونی پاشاکەی –بەهیچ جۆرێك– جێبەجێ نەکردووە، وە ملکەچ نەبووە بۆی وە لەسەری پێویست نەبووە کە بەگوێرەی بڕوا..

جا ئایا ئەمڕۆ لە وەزارەتەکانی طاغوتەکان یان پەرلەمانەکانیان شتێکی ئاوا هەیە؟؟ واتە بارودۆخی وەزیر تیایدا وەك ئەوە بێت هەروەك دەڵێن ( دەوڵەتێك لەناو دەوڵەتێك)..؟؟ ئەگەر نەبوو ئەوە لێرەدا هیچ ڕوویەك نیە بۆ بەراورد کردن و لێکچواندن..

**٣**– یوسف –سەلامی خوای لێبێ– ئەم وەزارەتەی گرتە ئەستۆ بە قایمکردن و جێگیر کردنێك لە خوای گەورەوە، خوای گەورە دەفەرموێ:" **وكذلك مكنا ليوسف في الأرض**"[٤٩] [واتە: ئا بەو جۆرە –یوسفمان– پایەدارو جێگیر کرد لە خاکی میسردا]. جا بۆیە ئەوە جێگیرکردنە لە خواوەیە، نە بۆ پاشاکەو نەبۆ هی تر نیە کە زیانی پێبگەیەنن یان لەو پلەو کارەی لای بدەن، هەتا ئەگەر پێچەوانەی فەرمانی پاشا یان بڕیارەکەی یان دادوەریەکەشی بکات...

جا بۆ ئەو بێ شەرم و بێ ئابڕووانە کە ئەمڕۆ لای طاغوتەکان – وەزارەتیان– گرتۆتە ئەستۆ لە کارە دڕاو هەلاهەلاکانیان، کە لەڕاستیدا گەمەیەکە بە دەستی طاغوتەوە، هیچ بەشێکیان لەم –تەمکین و جێگیرکردنەی خوای گەورە– هەیە، تاوەکو بەراوردکرنی لەسەر ئەو گرتنەئەستۆیەی یوسف –سەلامی خوای لێبێ– و ئەو جێگیر کردن و پایەدارکردنەی دروست بێت؟

---

[٤٨] سورەتی (یوسف) ئایەتی ٧٦.

[٤٩] سورەتی (یوسف) ئایەتی ٥٦.

٤- بێگومان یوسف -سەلامی خوای لێبێ- وەزارەتەکەی لە پاشاوە گرتەئەستۆ (بە پشت بەستیەکی - حصانة-) ڕاستەقینەو تەواو، خوای پاك و گەورە دەفەرموێ:" **فلما كلّمه قال إنك اليوم لدينا مكين أمين**"[٥٠] [واتە: جا کاتێ -پاشاکە- قسەی لەگەڵ کرد وتی: بەڕاستی تۆ ئەمڕۆ لای ئێمە خاوەنی پلەو پایەو باوەڕپێکراوی]. جا لە وەزارەتەکەیدا ئازادی هەڵسوکەوتی بۆ ڕەهاکرد بە تەواوی بەبێ کەم و کوڕی " **وكذلك مكّنا ليوسف في الأرض يتبوأ منها حيث يشاء**"[٥١] [واتە: ئا بەو جۆرە -یوسفمان- پایەدارو جێگیر کرد لە خاکی میسردا، لەهەر شوێنێکی -میسردا- بیویستایە دەژیا]. بۆیە هیچ بەرەنگارێك و لێپێچینەوەیەك و چاودێرێك لەسەر هەڵسوکەوتەکانی نیە هەرچۆنێك بێت، جا ئایا شتێکی هاوشێوەی ئەمە لە وەزارەتەکانی طاغوتەکانی ئەمڕۆ هەیە یان پشت بەستیەکی- حصانة- درۆو ساختەیە... بە خێرایی لادەبرێ و دەکێشرێتەوە ئەگەر وەزیر گەمەی بە کلکی کرد، یان شتێك لە سەرپێچی پیشان بدات یان دەرچوون بێت لە هێڵی ئەمیر یان دینی پاشا؟؟ جا وەزیر لایان هیچ نیە جگە لە خزمەتکاری سیاسەتەکانی ئەمیر یان پاشاکە نەبێ، ئەمیرایەتی دەکات بە فەرمانی ئەو وە بە نەهی ئەویش کۆتایی پێ دێنێت، وە مافی ئەوەی نیە کە پێچەوانەی فەرمانێك لە فەرمانەکانی پاشا یان دەستوورە دانراوەکە بکات ئەگەر دژیش بێت لەگەڵ فەرمانی خوای گەورەو ئاینەکەی...

وە ئەوەی پێی وایە کە شتێك لەوانە بە حاڵی یوسف - سەلامی خوای لێبێ- دەچێ لە گرتنەئەستۆکەیدا ئەوە بەڕاستی بۆختانێکی گەورەیی کردووە، وە کافر بووە بە خواو پاکانەی -خوای گەورەی- بۆ یوسف - سەلامی خوای لێبێ- بە درۆ خستۆتەوە...

جا ئەگەر زانرا بارودۆخ و هەڵوێستەکەی ئەو - سەلامی خوای لێبێ- ئەمڕۆ لە وەزارەتەکانی طاغوتەکان بوونی نیە... ئەوە لێرەدا هیچ پاساوێك نیە بۆ بەراورد کردن و لێکچواندن، جا کەواتە با لەو باسەدا دەست بەتاڵەکان واز لە زۆربلێی و چەنەبازی و وڕێنەکانیان بهێنن..

---

(٥٠) سورەتی (یوسف) ئایەتی ٥٤.

(٥١) سورەتی (یوسف) ئایەتی ٥٦.

سێیەم: لە وەڵامە پوچکەرەوەکان بۆ ئەم گومانە، ئەوەیە کە هەندێك لە ڕاڤەکارانی –قورئان– باسیان کردووە کە پاشاکە موسوڵمان بووە، ئەمەش لە (موجاهید)ی قوتابی (ئیبن عەبباس) گێڕدراوەتەوە –ڕەزای خوا لە هەردووکیان بێ–، ئەم قسەیەش بەبەڵگە کردنی ئەم چیرۆکە – بۆ ئەم باسە– لە بنەڕەتدا پاڵ دەدات – و لای دەبا–...

وە ئێمە ملکەچی بۆ خودا دەکەین و بڕوامان وایە کە بێگومان شوێن کەوتنێکی گشتی و تێکڕا یان ڕواڵەتی ئایەتێك لە پەرتووکی خوا شایەنترە لە قسەو لێکدانەوەو زۆرەبلێی و هەڵێنجانی گشت خەڵکی کە بێ بەڵگەو بێ بنەمایە.. جا لەوانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەمە، فەرموودەی خوای گەورەیە سەبارەت بە یوسف –سەلامی خوای لێبێ–:" **وكذلك مكنا ليوسف في الأرض**"[٥٢] [واتە: ئا بەو جۆرە –یوسفمان– پایەدارو جێگیر کرد لە خاکی میسردا].

ئەمەش بە کورتیە و خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە شوێنی تر بارودۆخی ئەو بڕوادارانەی ڕوونکردۆتەوە کە لە زەویدا پایەدارو بەدەسەڵات دەکرێن کە دەفەرموێ:" **الذين إن مكّناهم في الأرض أقاموا الصلاة وءاتوا الزكاة وأمروا بالمعروف ونهوا عن المنكر ولله عاقبة الأمور**"[٥٣] [واتە: ئەوانەی ئەگەر دەسەڵاتمان پێدان لە زەویدا بەچاکی نوێژ جێبەجێ دەکەن، وە زەکات بە تەواوی دەدەن، وە فەرمان بە چاکە دەکەن، وە قەدەغە لە خراپە دەکەن، وە سەرەنجامی هەموو کارەکان تەنها بەدەست خوایە].

بێگومان یوسف – سەلامی خوای لێبێ– لەوانەیە و بگرە لە گەورەکانیانە، ئەوانەی ئەگەر خوا پایەدارو دەسەڵاتداریان بکات فەرمان بە چاکە دەکەن و نەهی لە خراپە دەکەن.. وە لای ئەوانەی ئاینی ئیسلامیان ناسیوە شتێکی بێ شك و گومانە کە گەورەترین چاکە لەو ئایینەدا بریتیە لە یەکتاپەرستی کە ئەمە بنچینەی بنچینەکان بووە لە بانگەوازی یوسف و باووباپیرانی –سەلامی خوا لە هەموویان بێ–.. وە گەورەترین خراپە بریتیە لە شیرك (هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردن) کە یوسف ئاگاداری دەکردنەوە خۆیانی لێ بەدووربگرن

[٥٢] سورەتی (یوسف) ئایەتی ٥٦.

[٥٣] سورەتی (الحج) ئایەتی ٤١.

و دوژمنایەتی خواکانیانی دەکرد.. وە لەوەی بەڵگەیەکی ڕوون ئاشکراو یەکلاکەرەوە هەیە کە یوسف پاش ئەوەی خوا دەسەڵاتدارو جێگیری کردووە ڕێبازی باووباپیرانی یەعقوب و ئیسحاق و ئیبراهیمی درکاندووە، فەرمانی پێ کردووە نەهی و دژایەتی هەرشتێکی کردووە کە جیاوازو پێچەوانەی بێت... جا یوسف نە حوکم و فەرمانڕەوایی بە شتێك کردووە جگە لەوەی خوا دایبەزاندووە، وە نە یارمەتی فەرمانڕەوایی کردنی داوە بەجگە لەوەی خوا دایبەزاندووە، وە نە یارمەتی یاسادانەرەکان و طاغوتە جگە لە خوا پەرستراوەکانی داوە وە نەسەری خستوون یان پشتگیری کردوون هەروەك ئەمڕۆ شەیداکان ئاوان لە کارەکانیاندا...

– یوسف ئەمانەی نەکردووە– چ جای ئەوەی هاوبەشیان بکات لە یاسادانانیان هەروەك ئەمڕۆ شەیداکان لە پەرلەمانەکاندا ئاوا دەکەن بەڵکو بەبێ پەشیمانی دەوترێ کە ئەو –یوسف– نکۆڵی بارودۆخیانی کردووەو خراپەکانیانی گۆڕیوەو فەرمانڕەوایی بە یەکتاپەرستی کردووەو بانگەوازی بۆ کردووەو ئەوەی سەرپێچی کردووەو هەڵیوەشاندۆتەوە فڕێی داوەو دووری خستۆتەوە جا هەرکەسێك بێت... ئەمەش بە دەقی فەرمایشتی خوای گەورە... وە کەسێك –یوسفی– ڕاسگۆی بەڕێزی کوڕی دوو بەڕێزەکە بە جگە لەمە باس ناکات مەگەر کافرێکی پیس نەبێ کە بەری بوو لە ڕێبازە پاکە خاوێنەکەی...

وە لەوانەی کە دیسان لەسەر ئەمە بەڵگەن، بەڵگەیەکی ئاشکرا وە دووپاتی لەسەر دەکەنەوە.. ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی ئەو فەرمایشتە پوختەی خوای گەورە:" **وقال الملك ائتوني به استخلصه لنفسي فلما كلمه قال إنك اليوم لدينا مكين أمين**"[٥٤] [واتە: وە پاشاکە وتی: ئەو –یوسفەم– بۆ بێنن دەیکەمە –کەسێکی– تایبەت بە خۆمەوە ، جا کاتێك –پاشاکە– قسەی لەگەڵ کرد، وتی: بەڕاستی تۆ ئەمڕۆ لای ئێمە خاوەنی پلەو پایەو باوەڕپێکراوی]. دەبێ چ قسەیەك بێت کە لێرەدا یوسف وتویەتی بە پاشا، تا پێی سەرسام بووەو پایەدارو جێگیری کردووەو باوەڕی پێکردووە؟؟ ئایا وا دەبینی یوسف خەریکی

---

[٥٤] سورەتی (یوسف) ئایەتی ٥٤.

باسکردنی بەسەرهاتی خێزانی عەزیز بووە کە کۆتایی هاتووەو ڕاستی تیایدا دەرکەوتووە... یان وا دەبینی لەسەر یەکێتی نیشتیمانی قسەی لەگەڵ کردووە!! وە گرفتە دارابیەکان!! وە.. وە.. یان چی؟؟؟

بۆ کەس نیە تفەنگ بەتاریکیەوە بنێ و لێرەدا بەبێ بەڵگە قسە بکات، ئەگەر واشی کرد ئەوە لە درۆزنەکانە.. بەڵام ئەوەی فەرمایشتی خوای گەورە:" **فلما كلمه**" [واتە: جا کاتێك –پاشاکە– قسەی لەگەڵ کرد] ڕوونی دەکاتەوەو تەفسیری دەکات ڕوون و ئاشکرایە لە فەرمایشتی خوای گەورە:" **ولقد بعثنا في كلِّ أمةٍ رسولاً أنِ اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت**}"[(٥٥)] [واتە: سوێند بە خوا ئێمە لەناو هەر گەل و ئوممەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی تەنها خوا بپەرستن و دوور کەونەوە لە –پەرستنی– هەر پەرستراوێکی تر].

وە فەرمایشتی خوای گەورە:" **ولقد أُوحي إليك وإلى الذين من قبلك لئن أشركتَ ليحبطن عملك ولتكونن من الخاسرين**}"[(٥٦)] [واتە: وە سوێند بە خوا وەحی و نیگا کراوە بۆ تۆ وەبۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی بەڕاستی کاروکردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوە، وە بێگومان لە زەرەرمەندان دەبیت].

وە فەرمایشتی خوای گەورە لە باسی گرینگترینی شتەکان لە بانگەوازی یوسف –دروودو سەلامی خوای لێبێ–:" **إني تركتُ ملّة قومٍ لا يؤمنون بالله وهم بالآخرة هم كافرون * واتبعت ملّة ءاباءي إبراهيم وإسحق ويعقوب ما كان لنا أن نشرك بالله من شيء..**"[(٥٧)] [ واتە: بەڕاستی من وازم هێناوە لە ئاینی گەلێك کە بڕوا بە خوا ناهێنن هەروەها ئەوان بێ بڕواش بوون بە ڕۆژی دوایی* وە شوێن ئایینی باوو باپیرانم کەوتوم کە ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبن، هەرگیز بۆ ئێمە ڕەواو شیاو نیە کە هیچ شتێك بکەین بە هاوبەش و شەریك بۆ خوا] .

وە فەرمایشتی خوای گەورە لەبارەیەوە:" ...**ءأربابٌ متفرقون خيرٌ أم الله الواحد القهار* ما تعبدون من دونه إلا أسماءً سميتموها أنتم وءاباؤكم ما أنزل الله بها من سلطان إنِ**

---

(٥٥) سورەتی (النحل) ئایەتی ٣٦.

(٥٦) سورەتی (الزمر) ئایەتی ٦٥.

(٥٧) سورەتی (یوسف) هەردوو ئایەتی ٣٧–٣٨.

**الحكم إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيّم ولكن أكثر النّاس لا يعلمون**"[٥٨] [واته: ... ئايا چەند خوايەكی چەند جيا جيا باشترن يان خوايەكی تاكی بەدەسەڵات، ئێوە بێجگە لە خوا هيچ شتێك ناپەرستن جگە لە چەند ناوێك نەبێت كە ئێوەو باوو باپيرانتان ناوتان ناون، خوا هيچ بەڵگەيەكی دەربارەيان نەناردۆتە خوارەوە، بێگومان بڕيار تەنها بۆ خوايە، فەرمانی داوە بێجگە لەو هيچ شتێك نەپەرستن، ئەوەيە ئاينی ڕاستی دامەزراوی نەگۆڕ، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن].

بێگومان ئەمە گەورەترين قسەيە لای يوسف –سەلامی خوای لێبێ–، ئەمەيە دينی پتەو لای ئەو وە بنچينەی بنچينەكانی بانگەوازەكەی و ڕێبازەكەی و ڕێبازی باووباپيرانی.. جا ئەگەر فەرمانی كرد بە چاكەيەك ئەوە گەورەترين چاكەيەكە كە دەيزانێ.. وە ئەگەر نەهی كرد لە خراپەيەك ئەوە لای ئەو خراپەيەك نيە لەوە خراپتر بێت كە پێچەوانەی ئەو بنچينەيە بێت و بەرەنگاری بێت.. ئەگەر ئەمەش جێگير بوو..وە وەڵامی پاشاكە بريتيی بوو لە:" **إنك اليوم لدينا مكينٌ أمين**" [واتە: بەڕاستی تۆ ئەمڕۆ لای ئێمە خاوەنی پلەو پايەو باوەڕپێكراوی] ئەوە بەڵگەيەكی ڕوونە لەسەر ئەوەی پاشاكە شوێنی كەوتووەو ڕازی بووە لەسەری وە ڕێبازی كوفری جێهێشتووەو شوێن ڕێبازی ئيبراهيم و ئيسحاق و يەعقوب و يوسف كەوتووە – سەلامی خوا لە هەموويان بێ–

يان ئەگەر دەتەوێ بڵێ: لە كەمترين بارودۆخدا لێی گەڕاوە لەسەر يەكتاپەرستيەكەی و ڕێبازی باووباپيرانی، وە ئازادی قسەكردن و بانگەوازی بۆی و گەوجكردنی سەرپێچيكەرانی بۆ ڕەها كردووەو هيچ بەرهەڵستی لەمانە بۆ نەبووە وە فەرمانی پێنەكردووە بە شتێك كە هەڵوەشێنەرەوەی يان پێچەوانەی بێت... وە ئەوەندەت بەسە –بۆ زانينی– جياوازيەكی گەورە لە نێوان ئەم بارودۆخەی يوسف –سەلامی خوای

(٥٨) سورەتی (يوسف) هەردوو ئايەتی ٣٩-٤٠.

لێبێ–... وه له نێوان شەیداکان له پشتیوانانی طاغوتەکان و یارمەتیدەرانیان له وەزارەتەکانی ئیمڕۆ یان بەشداربوەکانیان له یاسادانانداندا له پەرلەمانەکانیان.. [٥٩].

---

[٥٩] وه –کەس– لەسەر ئەو قسەیەی پێشتر چەواشه نەبێت و ئاژاوه نەنێتەوه به بەڵگەی ئەوانەی که فەرمایشتی خوای گەوره له سورەتی (غافر) دەکەنه بەڵگه لەسەر زوبانی باوەڕدارێکی خزمانی فیرعەون:" ولقد جاءكم يوسف من قبل بالبينات فما زلتم في شك مما جاءكم به حتى إذا هلك قلتم لن يبعث الله من بعده رســــــــــولاً.." واته:( سوێند به خوا بێگمان پێشتر (یوسف)تان بۆ هات بەبلگه ڕونەکانەوه، کەچی ئێوه هەر له گوماندا بوون لەو بەڵگانەی بۆی هێنابوون، تا کاتێ –یوسف– وەفاتی کرد ووتتان دوای ئەو خوا هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێ..)، لەبەر چەند ڕویەکەوه:–

١– ئایەتەکه بەڵگەیەکی ئاشکراو بێ خەوش نیه لەسەر ئەوەی که یوسف لێره بریتیه له یوسفی کوڕی یەعقوب.. دەشێ ئەوه یەکێکی تر بێت، هەندێ له لێکدەرەوانی قورئان ئەم ڕوەیان باسکردووه، وه گوتویانه ئەمه یوسفی کوڕی ئەفرانیمی کوڕی یوسفی کوڕی یەعقوبه که بیست (٢٠) ساڵ له نێویان پێغەمبەر بووه، ئەمەش گێڕراوەتەوه له کوڕی عەبباس – ڕەزای خوا له هەردوکیان بێت–.. بڕوانه تەفسیری قورطوبی.. وه بەڵگەش ئەگەر ئەگەری کەوته ناو ناشێ بۆ بەڵگه.

٢– گریمان لەم ئایەته مەبەست –له یوسف– یوسفی کوڕی یەعقوبه –سەلامی خوا لەهەردوکیان بێ– ئەوه ئایەتەکه دیسان بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا نیه لەسەر ئەوەی پاشاکه لەسەر کوفرەکەی ماوەتەوه، بەڵکو قسەکه –لەئایەتەکه– لەسەر زۆربەی بەنو ئیسرائیله.

٣– ئایەتەکه کوفرێکی ڕوون و ئاشکرای باس نەکردووه بەڵکو باسی گومانی کردووه، وه گومانیش دەکرێ له دڵدا بێت و له کاتێکدا بشاردرێتەوەو دواتر له کاتێکی تردا بەدەر بکەوێت.. جا ئەگەر ئەوه جێگیر بوو که یوسف پایەدار کراوه لەم زەمینەداو فەرمانی به چاکه کردووەو نەهی کردووه له خراپه هەروەك له پێشتر باسکرا، –یوسف سەلامی خوای لێبێ– بەهیچ جۆرێك له هیچ کەسێك ڕازی نابێت کەله پێشیدا به ئاشکرایی شیرك بکات... وه بگره هیچ کەس جەسارەتی ئەمه ناکات چونکه ئەو فەرمانڕەوایه یان حاکم وه له هەمان کاتیشدا پێغەمبەریشه وه گەورەترین تاوان لای ئەو شیرکه.. بەڵام لەوانەیه ئەمەی له دڵدا شاردبێتەوەو خاوەنەکانی باوەڕێکی ڕووکەشیان دەرخستووه له ترسی دەسەڵاتی حەق و ڕاستی.. ئەمەش دووڕوویه، دووڕوانیش له دونیادا به ڕواڵەت هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرێ.. بگره له فەرمایشتی خوای گەوره :" حتى إذا هلك قلتم لن يبعث الله من بعده رسولاً.." واته:( تا کاتێ –یوسف– وەفاتی کرد ووتتان دوای ئەو خوا هیچ پێغەمبەرێکی تر نانێرێ..) بەڵگەیەك هەیه لەسەر باوەڕیان به پێغەمبەرایەتیەکەی ئەگەر له ڕواڵەتیشدا بوو بێت.

وه لێرەدا ئاگاداریەك پێویسته که هەندێ له شەیداکان بەهەمان شێوه له گومانەکانیان لەم بابەتەدا باسی باوەڕدارەکەی خزمی فیرعەون دەکەن به بەڵگەی ئەوەی که ئەو باوەڕی خۆی دەشاردەوه.. ئێمەش دەڵێین: ڕووی بەڵگه له کوێیه لەو مشتومڕی نێوانمان له بەسەرهاتی ئەو باوەڕداره؟ لەڕاستیدا جیاوازیەکی فراوان هەیه له نێوان شاردنەوەی باوەڕو داپۆشینی بۆ کەسێکی بێ دەسەڵات لەگەڵ بەشداری کردن له کوفرو و شیرك و یاسادانان و کۆبوونەوه لەسەر ئایینێك جگه له ئاینی خوای گەوره.. جا ئێوه دەتوانن بۆمان بسەلمێنن که ئەو باوەڕداره یاسای

چوارەم: ئەگەر گشت ئەمانەی پێشتر زانی وە بەدڵنیاییەوە لات چەسپا کە گرتنە ئەستۆی وەزارەتەکەی یوسف –سەلامی خوای لێبێ– نە پێچەوانە بوو بۆ یەکتاپەرستی وە نە هەڵوەشێنەرەوە بوو بۆ ڕێبازو میللەتی ئیبراهیم هەروەك ئەمەیە بارودۆخی ئەوانەی دەیگرنە ئەستۆ لەم سەردەمەدا..

جا لەسەر گریمانی ئەوەی پاشاکە لەسەر کوفرەکەی مایەوە.. ئەوە بابەتی گرتنەئەستۆی یوسف بۆ ئەو فەرمانڕەوایەتیە بابەتێکە لە بابەتە لاوەکیەکان کەلە بنچینەی ئاییندا هیچ گرفتی لەسەر نیە، لەبەر ئەوەی لە پێشتردا جێگیربوو کە یوسف کوفر یان شیرك یان پشتگیری کافران یان یاسادانان لەگەڵ خوای نەکردووە، بەڵکو فەرمانی بە یەکتاپەرستی کردووەو نەهی لەگشت ئەمانە کردووە.. خوای گەورەش لە باسی بڕیارە لاوەکیەکان فەرمویەتی: " **لكلٍّ جعلنا منكم شِرعةً ومنهاجاً**"[٦٠] [واتە: بۆ هەر ئوممەتێك لە ئێوە شەریعەت و ڕێگەیەکی ڕوونمان داناوە]. جا شەریعەتی پێغەمبەران لە بڕیارە لاوەکیەکاندا دەکرێ جۆراوجۆر بێت، بەڵام لە باسی یەکتاپەرستیدا یەك شتە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: " نحن معاشرَ الأنبياء إخوةٌ لعلات ديننا واحد"[٦١] [واتە: ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران براین لە باوکێك و دایکی جیاواز، دین و ئاینمان یەکە] واتە: بران لە دایکی جیاواز، وە باوکەکەش یەکە... وەك ئاماژەیەك بۆ ڕێککەوتن لە بنچینەی یەکتاپەرستی و جۆراوجۆری لە لقەکانی شەریعەت و ئەحکامەکانیدا... چونکە دەکرێ شتێك لە باسی ئەحکامەکان لە شەریعەتەکانی پێش ئێمە قەدەغەو حەرام بووبێت و دواتر بۆ ئێمە حەڵاڵ بێت وەك دەستکەوت (غەنیمەت)، وە بە پێچەوانەوەش دەکرێ، یان شتێك لەسەر ئەوانەی

---

داناوە وەك ئێوە کە یاسا دادەنێن یان ئەو بەشداری کردووە لە حوکم و فەرمانڕەوایی کردن بە جگە لەوەی خوا دایبەزاندووە هەروەك ئێوە بەشداری دەکەن یان ئەو لەگەڵیان لەسەر دیموکراسی یان ئایینێك جگە لە ئاینی خوا کۆبویەوە هەروەك ئێوە دەیکەن؟؟؟ سەرەتا ئەمە بسەلمێنن لەدوایشدا دامالینی قەتاد [ڕووەکێکە دڕکێکی وەك دەرزی هەیە، ئەم پەندەش بە مانای گرتنی سەرەوەی ئەم ڕووەکە دڕکاویەیەو دەست بەسەرداهێنانیەتی بەرەو خوارەوە] پاشان بەڵگە بە کارەکەی ئەو بهێننەوە.. ئەگەریش نا واز لەو چەنەبازی و وڕێنانەتان بێهنن..

[٦٠] سورەتی (المائدة) ئایەتی ٤٨.

[٦١] بوخاری لە (ئەبو هورەیرە)ەوە گێڕاویەتەوە.

پێش ئێمە توند بووە بۆ ئێمە سوك کراوە، وەهەروەها.. جا بۆیە هەر شەرعێکی پێش شەرعی ئێمە نابێتە شەرع بۆ ئێمە.. بە تایبەت ئەگەر بەڵگەیەك لە شەرعی ئێمە پیچەوانەی بێت..

وە لەشەرعی ئێمەدا بەڵگەی دروست –صحیح– هەن لەسەر پێچەوانەی ئەمەی کە بۆ یوسف –سەلامی خوای لێبێ– ڕێگەپێدراو بووە، وە لەسەر ئێمە قەدەغەکراوە.. ئیبن حیببان لە صەحیحەکەی و ئەبو یەعلا و طەبەرانی دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: " لَيَأْتِيَنَّ عَلَيكُمْ أُمَرَاءُ سُفَهاء يُقَرِّبُونَ شِرَارَ النَّاسِ، وَيُؤَخِّرُونَ الصَّلاةَ عنْ مَوَاقِيتِهَا، فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَلا يَكُونَنَّ عَرِيفًا، ولا شُرْطِيًّا، ولا جَابِياً، ولاخَازِناً " [واتە: بێگومان هەندێ ئەمیری گەوج دێنە سەرتان – و فەرمانڕەواییتان دەکەن– خراپترینی خەڵکی لەخۆیان نزیك دەکەنەوە، وە نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا دوادەخەن، جا ئەوەی لە ئێوە گەیشتە ئەمە، ئەوە نەبێتە عەریفیان، وە نە پۆلیسیان، وە نە باج سێنیان، وە نە گەنجینەوانیان].

ئەوەی کە پەسندترو گونجاوترە ئەو ئەمیرانە کافر نەبوونە، بەڵکو کەسانی فاجیری گەوج بوونە، چونکە وریاکەرەوە ئەگەر ئاگاداریەك بکاتەوە باسی گەورەترین خراپی و کارە بەدەکان دەکات، ئەگەر ئەوانە کافر بونایە ئەوە پێغەمبەر ﷺ ڕوونی دەکردەوە، بەڵام لێرەدا گەورەترین تاوانەکانیان کە پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە بریتیە لە نزیك کردنەوەی خراپترینی خەڵکی و دواخستنی نوێژەکان لە کاتی خۆی.. لەگەڵ ئەمەش ئا لێرەدا پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە، نەهیەکی ڕوون و ئاشکرا، لەوەی کە کەسێك ببێتە گەنجینەوانیان.. جا ئەگەر لە شەرع و بەرنامەی ئێمەدا گرتنە ئەستۆی فەرمانبەرایەتی گەنجینەوانی لای ئەمیری زۆردار نەهی لێ کرابێت و قەدەغەکراو بێت.. جا دەبێ گرتنە ئەستۆی وەزارەتی گەنجینە لای پاشاکانی کوفرو ئەمیرەکانی شیرك و هاوبەشی دانان چۆن بێت؟ " **قال اجعلني على خزائن الأرض إني حفيظٌ عليم**"[٦٢] [واتە:(–یوسف– بە پاشاکەی وت لەسەر خەزنەو دارایی زەوی –میسر– دا دامنێ، بەڕاستی من پارێزەرێکی شارەزام]. ئەمە دەلیلێکی دروست –صحیح– و بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کە ئەمە شتێکە لە

---

[٦٢] سورەتی (یوسف) ئایەتی ٥٥.

شەرعی پێش ئێمە، وە ئەمە لەشەرعی ئێمەدا لابراوەو نەسخ کراوەتەوە... وە خوای گەورەش زاناترە..

وە ئەوەندەش بەسە بۆ ئەوانەی ڕێنموییان دەوێ.. بەڵام ئەوەی بەباشزانین و بەچاکزانین و قسەی پیاوان پێش دەلیل و بەڵگەکان بخات، ئەگەر چیاکان لەبەر دەستیشیدا سەر لێکبدەن ئەوە ڕێنمویی دەستناکەوێت، " **ومن يرد الله فتنته فلن تملك له من الله شيئاً**.." [٦٣] [ واتە: وە هەرکەسێ خوا بیەوێت کافرو گومڕای بکات، ئەوە تۆ لەبەرامبەر خوادا هیچت پێ ناکرێ بۆی..].

وە لەکۆتاییدا پێش ئەوەی قسەکان لەسەر ئەو گومانە تەواو بکەم ئاگاداری ئەوە دەکەم کە هەندێك لەو شەیدایانەی کە ڕێ بە شیرك و کوفر دەدەن بە بەباشزانین و بەچاکزانینەکانیان وە –ڕێ دەدەن بە– چوونە ناو وەزارەتە کوفریەکەو پەرلەمانە شیرکیەکان وتەیەکی کەڵە پیاوی ئیسلام ئیبن تەیمیە –ڕەحمەتی خوای لێبێ– سەبارەت بە گرتنە ئەستۆی وەزارەتەکەی یوسف –سەلامی خوای لێبێ– تێکەڵ بە بەڵگەو گومانەکانیان دەکەن... وە لەڕاستیدا ئەمەش لە پۆشینی حەق و ڕاستیە بە درۆو ساختەیی وە بۆختانێکە لەسەر کەڵە پیاوی ئیسلام وەقسەکردنە بەناوی ئەو کە نەیوتووە.. چونکە ئەو – ڕەحمەتی خوای لێبێ– بەسەرهاتی یوسفی –سەلامی خوای لەسەر بێ– نەکردۆتە بەڵگە بۆ ڕێپێدانی بەشداری کردن لە یاسادانان و کوفر یان حوکم و فەرمانڕەوایی کردن بە جگە لەوەی خوا دایبەزاندووە... پەنا بەخوا ئێمە کەڵە پیاوی ئیسلام و ئایینەکەی و بگرە بیرو هۆشەکەشی بە پاك ڕادەگرین لەو جۆرە قسە ناشیرینانە کە کەس نەیوێراوە ئەو قسانە بکات جگە لەو بێئابڕووانە لەو سەردەمەی دوایدا، ئەوە دەڵێین.. هەتاوەکو ئەگەر لەو باسەشدا قسەکەی ئەو نەخوێنینەوە، چونکە قسەیەکی لەم جۆرە کەسێکی هۆشمەند نایکات، چ جای ئەوەی لە زانایەکی خواناس و زانای وەك کەڵە پیاوی ئیسلام – ڕەحمەتی خوای لێبێ– دەربچێ... جا چۆن دەبێ کە قسەکەشی لەو باسەدا ڕوونەو ئاشکرایە.. کەوا هەمووی ئەڕژێتە سەر بنچینەی لادانی گەورەترینی دوو خراپەو بەدەستهێنانی بەرزترینی دوو بەرژەوەندی لە کاتی

---

[٦٣] سورەتی (المائدة) ئایەتی ٤١.

دژ بوونەوەیاندا.. ئەوەشت زانی کە گەورەترینی بەرژەوەندیەکان لە بووندا بریتیە لە بەرژەوەندی یەکتاپەرستی وە گەورەترینی خراپەکانیش بریتیە لە خراپی شیرك و هاوبەشی دانان.. جا –ئیبن تەیمیە– باسی کردووە کە یوسف –سەلامی خوای لێبێ– ئەوەی لە توانایدا بوو کردویەتی و لەسەری وەستاوە لە دادوەری و چاکەدا، هەروەك لە (حِسْبَة) [٦٤] دا، کە لە باسی لەئەستۆگرتنەکەی دەڵێ :" وفَعلَ من العدل والخير ما قدر عليه ودعاهم إلى الإيمان بحسب الإمكان" [واتە: وە لە دادوەری و چاکەدا کردویەتی تا لەتوانایدا بووە، وە بانگی کردوون بۆ باوەڕ بە گوێرەی توانا] اه.

وە دەڵێ:" لكنْ فَعلَ الممكنَ من العدل والإحسان"[٦٥] [واتە:( بەڵام ئەوەی لە توانادا بووە کردوویەتی لە داوەری و چاکەدا] اه.

وە بەهیچ شێوەیەك باسی نەکردووە کە یوسف –سەلامی خوای لێبێ– یاسای داناوە لەگەڵ خوای گەورە یان هاوبەشی کردووە لە فەرمانڕەوایی کردندا بە جگە لەوەی خوا دایبەزاندووە یان شوێن دیموکراسی کەوتووە یان ئایینی تری پێچەوانەی ئاینە خوا، هەروەك ئەمە بارودۆخی ئەو شەیدایانەیە کە وتەی ئەو –ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ– تێکەڵ بە بەڵگە پووچ و گومانە بابردووەکانیان دەکەن بۆ گومڕاکردنی گەجەرو گوجەرەکان، وە بۆ ئەوەی حەق و ڕاستی بپۆشن بە درۆو وە ڕووناکیش بە تاریکی...

جا ئێمە ئەی باوەڕداری یەکتاپەرست... سەرکردەو ڕابەرمان کە لەکاتی مشتومڕدا بۆی دەگەڕێینەوە بریتیە لە وەحی و نیگا نە شتی تر – فەرموودەی خواو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ.. وە هەر کەسێك لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ لە قسەکانی وەردەگیرێ و هەندێکیشی دەگێڕدرێتەوەو ڕەت دەکرێتەوە– جا ئەگەر وەك ئەوەی ئەوان گومان دەبەن لە کەڵە پیاوی ئیسلام بیسترِاوە –وگوتویەتی–، حاشا لە ئەو، ئەوە لێمان وەرنەدەگرت وە لە زانای گەورەتریش لەو –وەرمان نەدەگرت–، تاوەکو بەڵگەمان لەسەری لە نیگا بۆ نەهێنێ.." **قل إنما أُنذِركم بالوحي** "[٦٦] [واتە: –ئەی محمد

---

[٦٤] مجموع الفتاوى: بەرگی ٢٨ لاپەڕە ٦٨.

[٦٥] مجموع الفتاوى: بەرگی ٢٠ لاپەڕە ٥٦.

[٦٦] سورەتی (الأنبياء) ئایەتی ٤٥.

ﷺ– بلێ: بێگومان من تەنها بە نیگاو سرووش ئێوە بێدار دەکەمەوە –و دەتانترسێنم–].
**"قلْ هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين"**(٦٧) [واتە: پێیان بلێ: بەڵگەتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن].

جا ئاگاداری ئەوەبە وە یەکتاپەرستیەکەت بە خرێنەکان بگەزە، وە لەخۆبایی یان کەمتەرخەم مەبە بە تێهەڵکێشان و پڕوپاگەندەو قسە بێ بنەماکانی پشتیوانانی شیرك و دوژمنانی یەکتاپەرستی.. یان –وابزانی– بە سەرپێچی کردنیان زەرەر دەکەی و زیانت پێ دەگات وە لە ئەهلی کۆمەڵی وەستاو لەسەر دینی خوا بە کە پێغەمبەر ﷺ باسیان دەکات بە فەرمایشتەکەی:" لا يضرّهم من خالفهم ولا من خذلهم حتى يأتيَ أمرُ الله وهم كذلك"(٦٨) [واتە: زیانیان پێ ناگەیەنێ ئەوەی پێچەوانەیان بکات وە ئەوەی خەجاڵەتیان بکات، تاوەکو فەرمانی خوا دێت، وە ئەوانیش هەر ئاوان].

(٦٧) سورەتی (البقرة) ئایەتی ١١١.

(٦٨) فتح الباری: بەرگی ١٣ لاپەڕە ٢٩٥.

# گومانی دووەم

# نەجاشی حوکم و فەرمانڕەوایی نەکردووە بەوەی خوا دایبەزاندووە و لەگەڵ ئەوەشدا موسوڵمان بووە

هەروەها ئارەزوبازەکان بەسەرهاتی نەجاشیان کردووەتە بەڵگە بۆ پینەکردن بۆ طاغوتە یاسادانەرەکانیان، جا یەکسانە چ فەرمانڕەوا بن یان ئەندام بن لە پەرلەمان یان شتی تر...

جا دەڵێین: نەجاشی پاش ئەوەی موسولمان بووە فەرمانڕەوایی نەکردووە بەوەی خوای گەورە دایبەزاندووەو لەسەر ئەمەش ماوەتەوە تاوەکو مردووەو لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ ناوی بردووە بە بەندەیەکی چاك و نوێژی لەسەر کردووەو فەرمانیشی بە هاوەڵەکانی کردووە نوێژی لەسەر بکەن.

جا ئێمە دەڵێین وە تەوفیقیش لای خوای گەورەیە:-

یەکەم: ئەو کەسەی ئەم گومانە وەریوە بابردووە دەکاتە بەڵگە، پێش هەموو شتێك پێویستە لەسەری بە دەقێکی دروستی (صەحیح) ڕوونی یەکلاکەرەوە لە بەڵگەدا بۆمان بسەلمێنێ کە نەجاشی پاش موسوڵمان بوونی حوکم و فەرمانڕەوایی نەکردووە بەوەی خوا دایبەزاندووە.. بەڕاستی من بەدوای قسەکانیان گەڕاوم لە یەکەمەکەی تا کۆتاییەکەی.. لە هەگبەیاندا شتێکم نەدۆزیەوە جگە لە چەند هەڵهێنجان و گومانێکی بێ بنەماو بەتاڵ کە نە دەلیلێکی صەحیح و نە بەڵگەیەکی ڕاست پشت ڕاستیان ناکاتەوە، وە خوای گەورەش دەفەرموێ:" **قل هاتوا بُرهانكم إن كنتم صادقين**"[٦٩] [واتە: پێیان بڵێ: بەڵگەتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن]. جا ئەگەر بەڵگەکەیان لەسەر ئەمە نەهێنا ئەوە لەڕاستگۆکان نین و بگرە ئەوانە لە درۆزنەکانن..

---

[٦٩] سورەتی (البقرة) ئایەتی ١١١.

دووەم: ئەوەی کە دانی پێدانراوە لەنێوان ئێمەو نەیارەکانمان ئەوەیە کە بێگومان نەجاشی پێش تەواو بوونی شەریعەت کۆچی دوایی کردووە.. بۆیە ئەو بێ شك مردووە پێش دابەزینی فەرمایشتی خوای گەورە:" **اليوم أكملتُ لكم دينكم وأتممتُ عليكم نعمتي ورضيتُ لكمُ الإسلام ديناً**..."[٧٠] [ واتە: ئەمڕۆ ئاینەکەتانم بۆ تەواو و کامڵ کردووە، وە چاکەو بەهرەی خۆم بە تەواوی ڕشتووە بە سەرتانداو ڕازی بووم کە ئیسلام ئاینتان بێت...].

چونکە ئەو ئایەتە لە حەجی ماڵئاوایی دابەزیوە، وە نەجاشیش زۆر پێش ڕزگارکردنی مەککە وەفاتی کردووە، هەروەك زانا ئبن کەثیر –ڕەحمەتی خوای لێبێ– و هیتریش وا باسیان کردووە..[٧١].

جا فەرمانڕەوایی کردن بەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە دەرحەق –بە نەجاشی– لەوکاتەدا، ئەوەیە کە فەرمانڕەوایی بکات وە شوێن ئەوە بکەوێت وە ئەو کارە بکات کە لە ئاییندا پێی گەیشتووە، چونکە ئاگاداری کردنەوە لەو جۆرە باسانەدا هەردەبێ قورئانی پێگەیشتنی تێدابێت، خوای گەورە دەفەرموێ:" **وأُوحِيَ إليَّ هذا القرآن لأُنذركم به ومن بلغ**.."[٧٢] [واتە: وە ئەو قورئانە سروش کراوە بۆ من بۆ ئەوەی ئێوەی پێ بترسێنم و پێتانی ئاگادار بکەمەوەوە و هەرکەسێکی تریش کە پێی دەگات..]. وە هۆکارەکانی گواستنەوەو پەیوەندی لەو سەردەمدا وەك ئەمڕۆ نەبووە، چونکە هەندێك لە شەریعەتەکان بە کەسەکە نەدەگەیشت مەگەر پاش چەند ساڵێك نەبێ، وە لەوانەشە هەر نەیزانێ مەگەر خۆی ئامادە بکات بۆ سەفەر بەرەو پێغەمبەر ﷺ... دین هێشتا هەر زوو بوو وە قورئانیش بەردەوام لە دابەزیندا بوو وە شەریعەتیش هێشتا تەواو نەبووبوو... ئەوەی بەڵگەیەکی ڕوونیشە لەسەر ئەمە.. ئەوەیەکە بوخاری و هی تر لە عەبدولڵای کوڕی مەسعود گێڕاویانەتەوە کە –پێغەمبەر ﷺ– فەرمویەتی:"كنا نُسلِّم على النبيِّ صلى الله عليه وسلم في الصلاة فيرد علينا، فلما رجعنا من عند النجاشي سلَّمنا عليه، فلم يرد علينا، وقال: إنَّ في الصلاة شغلاً" [واتە: ئێمە سەلاممان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد لە نوێژدا، ئەویش وەڵامی دەداینەوە، وە کاتێ لای

[٧٠] سورەتی (المائدة) ئایەتی ٣.
[٧١] بڕوانە: البداية والنهاية: بەرگی ٣ لاپەڕە ٢٧٧.
[٧٢] سورەتی (الأنعام) ئایەتی ١٩.

نەجاشی گەڕاینەوە سەلامان لێی کرد، وەڵامی نەدایەوە، وە فەرموی: بەڕاستی لە نوێژ کاری تر هەیە].. جا ئەگەر ئەو صەحابانەی لای نەجاشی بوون لە حەبەشە، لەگەڵ ئەوەی ئەوان –زمانی– عەرەبیشیان دەزانی و لە هەواڵی پێغەمبەریشیان دەکۆڵیەوەو بەدوای دەگەڕان، نەسخ بوونەوەو هەڵوەشاندنەوەی قسە کردن و سەلام کردنیان لە نوێژدا پێ نەگەیشتبوو سەرەڕای ئەوەی نوێژ فەرمانەکەی دیاریشە چونکە پێغەمبەر ﷺ لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج جار نوێژی بۆخەڵکی دەکرد... جا بۆ گشت پەرستن و شەریعەتەکان و سنوورەکانی تر چۆن دەبێ – وچۆن لێی ئاگادار دەبن و پێیان دەگات– کە وەك نوێژیش چەند جارە نابنەوە؟؟

جا ئەمڕۆ کەسێك هەیە لەوانەی کە دینداری دەکەن بە شیرکی دیموکراسی بتوانێ وا گومان ببات کە قورئان و ئیسلام یان دینی پێ نەگەیشتووە تاوەکو نارەوایی و ساختەییەکەی بە بارودۆخی نەجاشی، پێش تەواو بوونی شەریعەت، بەراورد و قیاس بکات...؟؟؟

سێیەم: ئەگەر ئەمە جێگیر بوو و چەسپا ئەوە پێویستە ئەوە بزانرێت کە نەجاشی حوکم و فەرمانڕەوایی بەوە کردووە کە پێی گەیشتووە لەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە، وە ئەوەی گومانێکی پێچەوانەی ئەمە ببا، هیچ ڕێگایەك نیە بۆ بەڕاست دانانی و وەرگرتنی قسەکەی مەگەر بە بەڵگە بێ:" **قل هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين**" [واتە: پێیان بڵێ: بەڵگەتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن].. وە ئەوانەی چیرۆکی –نەجاشی– دەکەنە بەڵگە گشت ئەو شتانەی باسی دەکەن بەڵگەنە لەسەر ئەوەی ئەو حوکم و فەرمانڕەوایی کردووە بەوەی پێی گەیشتووە لەوەی خوای گەورە دایبەزاندووە لەوکاتدا...

١– ئەوەی لەو کاتدا لەسەری پێویست بووە لە شوێنکەوتنی ئەوەی خوا دایبەزاندووە: (جێبەجێکردنی یەکتاپەرستی و باوەڕهێنان بووە بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد ﷺ وە بەوەی کە عیسا بەندەو ڕەوانەکراوی خوایە)... وە ئەمەشی کرد. سەیری ئەمە بکە لەو شتانەی کە ئەو گەلە دەیکەنە بەڵگە.. پەیامەکەی کە بۆ پێغەمبەری ﷺ ڕەوانە کرد..

(عومەر سولەیمان ئەشقەر) لە نامیلکەکەیدا باسی کردووە:( حوکمی بەشداری کردن لە وەزارەت و ئەنجومەنەکانی نوێنەران) [٧٣].

٢- وەهەروەها بەیعەتەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ وە کۆچکردنی بۆ لای ئەو، لەو پەیامەی پێشتر ئاماژەی بۆکرا نەجاشی باسی ئەوە دەکات:( ئەو بەڕاستی بەیعەتی داوەتە پێغەمبەر ﷺ وە کوڕێکی ئەو بەیعەتی داوەتە جەعفەرو هاوەڵەکانی وە لەسەر دەستی ئەو بۆ پەروەردگاری گشت جیهانیان موسوڵمان بووە، وە تیایدا هاتووە کە کوڕەکەی خۆی ( ئەریحای کوڕی ئەصحەمی کوڕی ئەبجەر)ی ناردووە بۆ لای ئەو، وە قسەکەی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دەتەوێ بێمە لات ئەوە دەیکەم، چونکە من شایەتی دەدەم ئەوەی تۆ دەیڵێی ڕاستە). جا لەوانەیە یەکسەر پاش ئەمە کۆچی دوایی کردبێ، یاخود پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا ئەمەی لێ نەویستووە... گشت ئەمانە شتی نادیارو نا ڕوونن لە چیرۆکەکەدا، بۆیە بڕیار لەسەردانی بە شتێك تیایداو کردنە بەڵگەی دروست نیە، چ جای ئەوەی پەکتاپەرستی و بنچینەکانی ئایینی پێ قڕبدرێ!!!

٣- وە هەروەها سەرخستنی پێغەمبەرو ﷺ ئایینەکەی و شوێنکەوتوانی، بەڕاستی نەجاشی ئەوانەی سەرخست کە کۆچیان بۆ لای ئەو کردبوو وە دالّدەی دان و ئارامی و چاودێری بۆ فەراهەم کردن، وە شەرمەزارو خەجاڵەتی نەکردن یان بیانداتەوە دەست قورەیش، وە لە گاوورەکانی حەبەشە نەگەڕا ڕوبەڕوی شتێکی خراپیان بکەنەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەوان بیروباوەڕە ڕاستەقینەکەیان سەبارەت بە عیسا -سەلامی خوای لێبێ- بەدەرخستبوو... وە بگرە لە پەیامەکەی تردا کە بۆ پێغەمبەری ﷺ ڕەوانە کرد ئەوە هاتووە ( وە عومەر ئەشقەر لە پەرتووکە ناوبراوەکەیدا لە لاپەڕە ٧٣ هێناویەتیەوە) کە ئەو کوڕەکەی لەگەڵ شەست پیاو لە خەڵکی حەبەشە ناردووە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ... وگشت ئەمانەش وەك سەرخستن و شوێنکەوتن و پشتگیریەك بۆی..

لەگەڵ ئەمەشدا عومەر ئەشقەر هەرەسی هێناوەو لە پەرتووکە ناوبراوەکەیدا (لاپەڕە ٧٣) بڕیاری لەسەر ئەوە داوە کە نەجاشی فەرمانڕەوایی نەکردوە بە یاساو

---

[٧٣] لاپەڕە ٧١ لە پەرتوکە ناوبراوەکە، وە هەروەها لە "زاد المعاد" یشدا: بەرگی٣ لاپەڕە٦٠.

دەستووری خوا، ئەمەش وەك زانیت درۆیەو بوختانە لەسەر ئەم یەکتاپەرستە.. بەڵکو ڕاستی ئەوەیە کە بوترێ بەڕاستی ئەو فەرمانڕەوایی بەوە کردووە کە پێی گەیشتووە لەوەی خوا دایبەزاندووە لەو کاتەدا، وە ئەوەی پێچەوانەی ئەمە بڵێ ئەوە بەڕاست دانانرێ مەگەر بە بەڵگەیەکی دروست و یەکلاکەرەوە نەبێ لەبەڵگەدا، ئەگەر نا ئەوە لە درۆزنەکانە:" **قل هاتوا برهانكم إن كنتم صادقين**" [واتە: پێیان بڵێ: بەڵگەتان بهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن] وە ئەو لەسەر ئەو بانگەشەی بەڵگەیەکی دروست و ڕوون و بێ خەوشی نەهێناوە، بەڵکو لە پەرتووکەکانی مێژوودا بەشەو لە شتانێك گەڕاوەو چیلکەی کۆکردۆتەوە کە گومانی وابووە کە بەڵگەن.. وە مێژووش بارودۆخی دیارەو زانراوە...

قەحطانی ئەندەلوسی –ڕەحمەتی خوای لێبێ– لە نونیەکەیدا دەڵێ:–

**لا تقبلن من التــوارخ كلما جمع الــرواة وخـط كـلُّ بنـانِ**

**ارو الحديث المنتقى عن أهـله سيما ذوي الأحـلام والأسـنانِ**

جا دەوترێتە ئەو و ئەوانی شوێنی کەوتوون:( تەختەکە و عەرشەکە جێگیر بکەن و بچەسپێنن دواتر نەخشی بکەن)..

چوارەم: بێگومان وێنەو ڕوخسار لە چیرۆکی نەجاشی دا بۆ حاکم و فەرمانڕەوایەکە کە کافر بووە پاشان زوو هێشتا لە پلەو کارەکەیدا بووە کە موسوڵمان بووە، جا ڕاستگۆیی موسوڵمان بوونەکەی دەرخستووە بە تەسلیم بوون و خۆبەدەستەوەدانێکی تەواو بۆ فەرمانی پێغەمبەرﷺ بەجۆرێ کە کوڕەکەی لەگەڵ چەند پیاوێك لە گەلەکەی بۆ لای ڕەوانە بکات وە کوڕەکەی لەگەڵیان بنێرێ بۆ لای و داوای لێ بکات تاوەکو ڕێی بدا کۆچ بکات بۆ لای و سەرخستنەکەی بۆی و سەرخستنی ئایینەکەی و شوێنکەوتنەکەی ئاشکرا بکات، وە بگرە نکۆڵیش لە بیروباوەڕەکانی خۆی و بیروباوەڕی گەلەکەو باوکانی پیشان بدا کە – دین و ئاینەکەی– هەڵدەوەشێنێتەوە... وە هەوڵ دەدات داوای حەق و ڕاستی دەکات و فێری دین و ئاین ببێت وە ڕووبکات و نزیك ببێتەوە تاوەکو دەگاتەوە لای خوا لەسەر ئەم بارودۆخە، ئەمەش پێش تەواوبوونی شەریعەت و – پێش ئەوەی– بەشێوەیەکی تەواو پێی بگات... ئا ئەمەیە وێنەی ڕاستەقینە کەلە فەرموودە دروستەکاندا لەبارەیەوە جێگیرە.. وە ئێمە لەڕووی ئەوانەدا دەوەستین جیاوازن

له ئێمه و تەحەددایان دەکەین که –بتوانن– جگه لەمه شتێکی تر بسەلمێنن.. بەڵام به بەڵگەیەکی دروست و ئاشکرا...

بەڵام وێنەی ئەوەی بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوەو بەراوردو قیاسی بۆدەکرێ وێنەیەکی شێوێنراوو جیاوازه، گشت جیاوازیەك، چونکه ئەوه وێنەی کۆمەڵێکه له خەڵکی که خۆیان بۆ ئیسلام دەگێڕنەوه بەبێ ئەوەی خۆیان بەری بکەن له هەڵوەشێنەرەوەکانی، وه بگره لەهەمان کاتدا خۆیان بۆ ئیسلام و هەڵوەشێنەرەوەکانی دەگێڕنەوەو شانازیشی پێوه دەکەن، خۆیان بەری نەکردووه له دینی دیموکراسی هەروەك نەجاشی خۆی بەری کرد له دینی دیان و گاورەکان، نەخێر.. بگره هێشتا ستایش و مەدحی دەکەن و بەسەریدا هەڵدەڵێن وه ڕێی پێدەدەن بۆ خەڵکی وەبانگیان دەکەن بۆ چوونه نێو ئایینه درۆین و پوچەڵەکەی.. وه خۆیان دەکەنه پەروەردگارو خواو یاسا له ئاییندا بۆ خەڵکی دادەڕێژن که خوا ڕێی پێنەداوە.. وه بگره لەگەڵیان بەشدار دەبن لەو یاسا دانانه کوفریه که بەگوێرەی بەندەکانی دەستووره دانراوەکه وه دەبێت ئەوانەی لەگەڵیان لەسەر ئایینه کوفریەکەیان کۆك دەبن و له ئەندامەکان یان وەزیرەکان یان هی تر له گەلەکاندا... وه لەسەر ئەو شیرکه سوور دەبن وه خۆی پێوه هەڵدەواسن وەبگره زەمی ئەوانه دەکەن که شەڕی دەکەن یا پێچەوانەی دەوەستن یان تانەی لێ دەدەن و هەوڵی ڕووخانی دەدەن... ئەمەش گشتی پاش دینه، وه – پاش ئەوەی– قورئان و بگره فەرموودەشیان پێ گەیشتووه..

جا توخوا ئەی کەسی به ویژدان و دادپەروەر جا تۆ هەرکەسێك بیت، ئایا دروسته ئەم وێنه شێوێنراوو ناشیرینه تاریکه بەراوردو قیاس بکرێت لەگەڵ ئەوەی کۆمکردەوه لەو جیاوازیه زۆرو فرەلایەنانه.. به وێنەی پیاوێکی تازه موسوڵمان بوو داوای حەق و ڕاستی دەکات و بەدوای سەرخستنی دەگەڕێت پێش تەواو بوونی بەرنامەو شەریعەتەکه و –پێش ئەوەی بەرنامەکەی– بەتەواوی پێ بگات.. له نێوان ئەم دوو وێنەو بارودۆخەدا جیاوازی یەکجار گەورە هەیە...

**والله ما اجتمعا ولن يتلاقيا    حتى تشيبَ مفارقُ الغربانِ**

بەڵێ دەکرێ پێکەوە کۆببنەوەو وەك یەك بن بەڵام لە تەرازوی حەق و ڕاستیدا نا.. بەڵکو لە میزانی تەرازوبازەکان لەوانەی خوا چاوەکانیانی کوێر کردووە، بۆیە دینداری دەکەن بە دینی دیموکراسی هەڵوەشێنەر بۆ یەکتاپەرستی و ئیسلام.

" **ویلٌ للمطففین * الذین إذا اکتالوا علی النَّاس یستوفون * وإذا کالوهم أو وزنوهم یُخسرون * ألا یظن أُولئك أنهم مبعوثون * لیومٍ عظیم**"[٧٤] [واتە: هاوار بۆ تەرازوو بازان* ئەوانەی کە پێوانەو کێشانە بکەن (بۆخۆیان) لەسەر -ماڵی- خەڵکی بە تەواوی وەریدەگرن* بەڵام کاتێك بۆیان پێوانە یان کێشانە دەکەن کەمیان دەدەنێ* ئایا ئەوانە نازانن کە بێگومان زیندوو دەکرێنەوە* لە ڕۆژێکی گەورەدا].

---

[٧٤] سورەتی (المطففین) ئایەتەکانی ١-٥.

## گومانی سێیەم

# ناونانی دیموکراسی بە ڕاوێژو شورا بۆ ڕێ پێدانی

ئەمەو هەندێك لە چاو کوێرو کوێرو شەمشەمەکوێرەکانی تاریکی بۆ ئایینە کوفریە پوچەڵەکەیان (دیموکراسی) ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە سەبارەت بە باوەڕدارە یەکتاپەرستەکان دەکەنە بەڵگە –کە دەفەرموێ– :" **وأمرهم شورى بينهم**" [واتە: وە کارو باری نێوانیان بە پرس و ڕاوێژە] وە بە فەرمایشتی خوای گەورە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ:" **وشاورهم في الأمـر**" [واتە:( وە لەکارو باردا ڕاوێژیان پێ بکە]. جا دیموکراسیە بۆگەنەکەیان ناوناوە بە ڕاوێژو شورا بۆ تەواو کردنی بۆیەی دینی شەرعی لەسەر ئەو مەزهەب و ڕێڕەوە کوفریە وە دواتریش ڕێ پێدانی و جائیز کردنی..

دەڵێین وە تەوفیقیش لای خوایە:

یەکەم: بەڕاستی گۆڕینی ناوەکان هیچ نرخێکی نیە تائەوکاتەی شتەکان یان ڕاستیەکان هەر وەك خۆیان بن و نەگۆڕابن... جا هەندێك لە گروپە بانگخوازیەکان کە ئەو مەزهەبە کوفریە دەگرنە بەرو دینداری پێدەکەن دەڵێن:( ئێمە مەبەستمان لە دیموکراسی ئەوەیە، کاتێ بانگ بەهۆیەوە بانگ دەکەین و بەهۆیەوە داوا دەکەین وە هانی دەدەین و هەوڵی بۆ دەدەین و بەهۆیەوە هەوڵ دەدەین –مەبەستمان پێی– " ئازادی وشەو بانگەوازیە"[٧٥]. وە چەنەبازی تری هاوشێوەی ئەمانە –دەڵێن–..

---

[٧٥] وە بگرە ئازادی وشە یان ئازادی بانگەواز هەروەك ئەوەی دیموکراسی دەیەوێ ئەوە ئازادیەکی پوچەڵ و کوفریە، چونکە کاتێ دیموکراسیەکان بانگی ئازادی وشە دەکەن لە و ئاینەیاندا، مەبەستیان تەنها ئازادی درکاندنی فەرمایشتی خوا نیە.. بەڵکو ئازادی قسەی طاغوت و کافرەکان و مولحیدەکان و موشریکەکان وە ئازادی بیروباوەڕ و هەڵگەڕانەوەو تانەدان لەگشت پیرۆزیەکان. ئەم کوفرەش لەوانەیە جێبەجێ کرابێ لە دیموکراسیەتی ڕۆژئاوا.. بەڵام دیموکراسیەتی عەرەب ئەوە ئازادی گشت کوفرو ئیلحاد و زەندەقەیەکی تیایە، وە ئیسلامیش لایان کەلەبچە و کۆت و زنجیر کراو و بەندکراو دوورخراوە، وە ئەم بانگخوازانەش بەرزترین هیواو ئاواتیان ئەوەیە کە خەڵك بگەیەننە دیموکراسیەتی ڕۆژئاوای کافرو جێبەجێی بکەن، وە کوفریش یەك میللەتە وە لە پلە پلەشە. جا ئاگاداربە.

جا ئێمەش پێیان دەڵێین: گرنگ ئەوە نیە کە ئێوە مەبەستتانە وە ئەوەی ئێوە پینەی دەکەن و خەیاڵی دەکەن.. بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ئەو دیموکراسە چیە کە طاغوتەکە جێبەجێی دەکات وە بانگتان دەکات بۆ چونە نێوی وە هەڵبژاردن لە پێناویدا ئەنجام دەدرێ و یاسادانان و فەرمانڕەوایی کە ئێوە بەشداری تێدا دەکەن بەگوێرەی ئەو دەبێت.؟ جا ئەگەر بە خەڵکی پێکەنین و فێڵتان لێ کردن، ئەوە هەرگیز لەگەڵ خوادا ئەمە ناتوانن " **إنّ المنافقين يُخادعون الله وهو خادعهم**"[٧٦] [واتە: بەڕاستی دووڕووەکان دەیانەوێ خوا بخەڵەتێنن، کەچی خوا خەڵەتێنەری ئەوانە]. " **يُخادعون الله والذين آمنوا وما يخدعون إلا أنفسهم وما يشعرون**"[٧٧] [واتە: -بەلای خۆیانەوە- خواو ئەوکەسانە دەخەڵەتێنن کە بڕوایان هێناوە کەچی کەس ناخەڵەتێنن تەنیا خۆیان نەبێت، بەڵام هەستی پێناکەن]. جا گۆڕینی ناوی شتەکان بڕیارەو حوکمەکان ناگۆڕێت وە حەرامێك حەڵاڵ ناکات یان حەڵاڵێك حەرام بکات... پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:" **لَيَسْتَحِلُّنَ طائفةٌ مِنْ أُمّتي الخمرَ باسمٍ يُسَمُّونَها إيَّاه**"[٧٨] [واتە:( بێ گومان کۆمەڵێك لە ئوممەتی من مەی حەڵاڵ دەکەن بەناوێك کەناوی لێ دەنێن].

ئەمەو زانایان ئەو کەسەیان کافر کردووە کە جوێن دەدات بە یەکتاپەرستی یان دژایەتی دەکات وە بە دینی خەواریجەکان یان -بەدینی- کافرکردن ناوی دەنێت، وە ئەوەشیان کافر کردووە کە شیرك بە چاك دەزانێ و ڕێی پێدەدات یان دەیکات و بەناوێکی تر ناوی دەنێت[٧٩]. هەروەك ئەمانە دەیکەن کە ئایینی کوفرو شیرك (دیموکراسی) ناودەنێن بە ڕاوێژو شورا.. بۆ جائیزکردنی و ڕێگەپێدانی و بانگکردنی خەڵکی بۆ چوونە نێوی..جا دووری بۆ وانە دوری...

دووەم: بەراورد کردن و قیاس کردنی دیموکراسی موشریکان لەسەر شورای یەکتاپەرستان و لێکچواندنی ئەنجومەنی شورا بە ئەنجومەنەکانی کوفرو فیسق و سەرپێچی لێکچواندنێکی ڕماو قیاس و بەراوردکردنێکی نارەوای کۆڵەکە داڕووخاوە، وە بێگومان

---

[٧٦] سورەتی (النساء) ئایەتی ١٤٢.

[٧٧] سورەتی (البقرة) ئایەتی ٩.

[٧٨] ئیمامی ئەحمەد لە "مسند" وكەیدا لە (عوبادەی کوڕی صامت) ی گێڕاەتەوە، ژمارە ٢٢٧٠٤.

[٧٩] بگەڕێوە: الدرر السنية في الأجوبة النجدية: بەرگی١ لاپەڕە١٤٥.

زانیت کە ئەنجومەنی گەل یان ئوممەت یان پەرلەمان پێگەیەکە لە پێگەکانی بتپەرستی و کۆشکێکە لە کۆشکەکانی شیرك، کە خواکانی دیموکراسی تیادا دادەنرێ وە هەروەها پەروەردگارە لەیەکتر جیاوازەکان و بەژداربوانیشیان کە بەگوێرەی دەستوورو قانوونە زەمینیەکانیان[٨٠] یاساو بەرنامەیان لە ئایین بۆ دادەنێن کە خوا ڕێی پێنەداوە. خوا دەفەرموێ:" **ءأربابٌ متفرقون خيرٌ أمِ الله الواحدُ القهّار * ما تعبدونَ من دونه إلا أسماءً سميتموها أنتم وءَاباؤكم ما أنزل الله بها من سلطانٍ إنِ الحكمُ إلا لله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيّمُ ولكنَّ أكثرَ النّاسِ لا يعلمونَ**"[٨١] [واتە: ئایا چەند خوایەکی جیا جیا باشترن یان خوایەکی تاکی بە دەسەڵات* ئێوە بێجگە لە خوا هیچ شتێك ناپەرستن جگە لە چەند ناوێك نەبێت کە ئێوەو باو باپیرانتان ناوتان لێناون، خوا هیچ بەڵگەیەکی دەربارەیان نەناردۆتە خوارەوە، بێگومان بڕیار تەنها بۆ خوایە، فەرمانی داوە بێجگە لەو هیچ شتێك نەپەرستن، ئەوەیە ئاینی ڕاستی دامەزراوی نەگۆڕاو، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن]

---

[٨٠] ماددەی ٢٥ لە دەستووری ئوردنی:( دەسەڵاتی یاسادانان بە پاشا و ئەنجومەنی گەل دەبەسترێتەوە).. وە خوشکەکەی لە دەستووری کوێتی ژمارە ٥١:(دەسەڵاتی یاسادانان ئەمیر و ئەنجومەنی گەل بەگوێرەی دەستوور سەرپەرشتی دەکەن)

[ وە ماددەی ٦١ لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق:( ئەنجومەنی نوێنەران ئەم کارانەی خوارەوەی لە ئەستۆ دایە: یەکەم: دانانی یاسا فیدراڵیەکان)، وە هەروەها ماددەی ٧٣:( سەرەك کۆمار ئەم دەسەڵاتانەی خوارەوەی هەیە: ... سێیەم: پەسەندکردن و دەرکردنی ئەو یاسایانەی ئەنجومەنی نوێنەران دایدەنێن، یاساکانیش بە پەسندکراو دەژمێردرێن پاش تێپەڕبوونی ١٥ ڕۆژ بەسەر ناردنیان بۆ سەرۆك کۆمار).

وە ماددەی ٤٠ لە پڕۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان–عێراق:( پەرلەمانی کوردستان–عێراق دەسەڵاتی یاسادانان و سەرچاوەی بڕیاردانە لەسەر پرسە چارەنووس سازەکانی گەلی هەرێمی کوردستان)، وە ماددەی ٥٣ :( پەرلەمان بێجگە لەو ئەرکانەی بەپێی یاسا کارپێکراوەکانی هەرێم پێی دەسپێردرێن ئەم ئەرکانەشی لەسەر شانە: ... سێیەم: ١– دانانی یاسا لە هەرێمی کوردستان...)، وە هەروەها ماددەی ٥٤ :( بەدەر لەو حوکمی برگەی (حەوتەم)ی ماددەی (٦٥)، کە لەم دەستوورەدا هاتووە، پەرلەمان بۆی نیە واز لە دەسەڵاتەکانی یاسادانانی خۆی بێنێ)].

[٨١] سورەتی (یوسف) هەردوو ئایەتی ٣٩–٤٠.

وە هەروەها دەفەرموێ:" **أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين ما لم يأذن به الله**"[٨٢] [واتە: ئایا -ئەو بێ بڕوایانە- هاوبەشانێکیان هەیە کە بەرنامەو ئاینێکیان بۆ داناون کە خوا ڕێگەی پێ نەداوە].

جا ئەو بەراورد کردن و قیاسە لـە هاوشێوەی بەراوردکرن وقیاسکردنی شیرکە لـەسەر یەکتاپەرستی و کوفرە لـەسەر باوەڕ.. وە بریتیشە لـە قسەکردن بەناوی خوا بەبێ زانست وە بوختان کردنە بە ئایینەکەی و درۆکردنە لـەسەر خوا، خۆتێخستن و ئیلحادیشە لـەبەرامبەر ئایەتەکانی خوای گەورە و پۆشینی حەقە لـەسەر خەڵکی بە درۆو نارەوایی و پۆشینی ڕووناکیە بە تاریکی..

ئەگەر ئەمە ڕوون بویەوە با موسوڵمان باش بزانێ کە جیاوازی ئاشکرا لـە نێوان شورا کە خوا بۆ بەندەکانی داناوە، وە لـە نێوان دیموکراسیەکی بۆگەنیدا وەکو جیاوازی نێوان ئاسمان و زەمینە... وە بگرە لـە گەورەییەکەیدا وەك گەورەیی نێوان دروستکارو دروست کراوەکانە.

- جا شورا سیستەم و ڕێبازێکی خواییە.. وە دیموکراسی لـە دەستکردی مرۆڤە ناتەواو ناکامڵەکانە ئەوانەی ئارەزوو حەزەکانیان لـەنگی کردوون و شیرازەیانی تێکداوە.

- شورا لـە بەرنامەی خوای گەورەو ئایینەکەی و حوکم و بڕیارەکانیەتی... وە دیموکراسی کوفرە بە بەرنامەو ڕێبازی خواو ئایینەکەی وە هەڵوەشێنەرەوەی حوکم وبڕیارەکەیەتی.

- وە شورا لـەشتێکە کە دەقی لـەسەر نەبێ، بەڵام لـەکاتی بوونی دەق ئەوە ڕاوێژو شورا نیە، خوای گەورە دەفەرموێ:" **وما كان لمؤمنٍ ولا مؤمنةٍ إذا قضى الله ورسولُه أمراً أن يكون لهم الخيرة من أمرهم**"[٨٣] [واتە: بۆ هیچ پیاو و ئافرەتێکی باوەڕدار نیە کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری هەر کارێکیان دا -بۆیان نیە- سەرپشك بن لـە کارەکیاندا]. بەڵام دیموکراسی بریتیە لـە سوکایەتی و گەمە کردن لـەگشت دەرگایەکەوە وە تیایدا بایەخ نیە بۆ

[٨٢] سورەتی (الشوری) ئایەتی ٢١.

[٨٣] سورەتی (الأحزاب) ئایەتی ٣٦.

دەقەکانی شەرع و بڕیارەکانی خوا بەڵکو بایەخ، وەگشت بایەخێك، لە دیموکراسیدا بۆ حوکم و بڕیاری گەل و یاسای گەلە لەگشت بوارەکاندا[٨٤]. بۆیەش لە دەستورەکانیاندا پێناسەیان کردووە بەو شێوەیە:( گەل سەرچاوەی گشت دەسەڵاتەکانە).

– وە دیموکراسی گەل وەك بەرزترین دەسەڵات دەزانێت لە بووندا کە بریتیە لە بڕیاری زۆرینەی گەل وە یاساو دەستووری زۆرینە وە ئایینی زۆرینە، زۆرینە حەلال دەکات وە زۆرینە حەرام دەکات... بۆیە زۆرینە بریتیە لە خواو پەروەردگار لە دیموکراسیدا... بەڵام لە شورادا گەل یان زۆرینە پەیوەستەو فەرمان پێکراوە بە گوێگرتن و گوێڕایەڵی کردن بۆ خواو پێغەمبەرەکەی و پاشان بۆ پێشەوای موسوڵمانان، وە پێشەوا پەیوەست ناکرێ بە بۆچوونی زۆرینەو بڕیارەکەی بەڵکو زۆینە فەرمانپێکراوە بە گوێگرتن و گوێڕایەڵی بۆ پێشەواکان، ئەگەر ستەمیش بکەن مادام فەرمانیان نەکردووە بە گوناه و تاوان[٨٥].

– جا دیموکراسی تەرازوەکەو خواکەی زۆرینەیە، وە ئەوەشە سەرچاوەی گشت دەسەڵاتەکانە.. بەڵام لە شورادا زۆرینە تیایدا شوێنەوارو میزان و تەرازویەکی نیە، بەڵکو خوا لە قورئانی پیرۆزدا بە ڕوونی بڕیاری لەسەر زۆرینە داوە کە دەفەرموێ:" **وإنْ تُطع أكثر من في الأرض يُضلوك عن سبيل الله إن يتبعون إلا الظن وإن هم إلا يخرصون**"[٨٦] [واتە: وە ئەگەر تۆ گوێ ڕایەڵی زۆربەی ئەوانە بیت لەسەر زەویدان لە ڕێگەی خوا گومڕت دەکەن، ئەوان هەر شوێنی گومان کەوتوون وە هەمیشە درۆو گۆترەکاری دەکەن]. " **وما أكثرُ النّاس ولو حرصتَ بمؤمنين**"[٨٧] [واتە: وە زۆربەی خەڵك نابنە ئیماندار، هەرچەندە تۆ سوور

---

[٨٤] ئەمە لە دیموکراسیەتی ڕۆژئاوای کافردا، بەڵام لە دیموکراسیەتی عەرەبی کافردا ئەوە یەکەم و دواهەمین نرخ و بایەخ (إعتبار) تیایدا بۆ پاشا یان ئەمیر یان سەرۆکە، چونکە بەبێ بەڕاستدانانی نرخێك نە بۆ قسەی گەل و نە ئەندامەکانی و نە ئەنجومەنی نیوێنەرانیان نیە، گشتی بەدەستی ئەوە کەی و چۆنی بیەوێت ئاوا هەڵیدەوەشێنێتەوەو دەیبەستێتەوەو گەمەی پێدەکات.

[٨٥] ئاگادار بە... ئەوە بۆ ئەو پێشەوای موسوڵمانانەیە کە حوکم و فەرمانڕەوایی بە شەرع و بەرنامەی خوا دەکەن، ئەوانەی رقەبەرایەتی دوژمنانی خوا دەکەن، نەك بۆ سووك و ڕیسواترینی خەڵکی لە فەرمانڕەوا کافرو هەلگەڕاوەکان، پشتیوان و براکانی جولەکەو دیانەکان..

[٨٦] سورەتی (الأنعام) ئایەتی ١١٦.

[٨٧] سورەتی (یوسف) ئایەتی ١٠٣.

بيت –لەسەر باوەڕهێنانیان–]. " **وإن كثيراً من الناس بلقائ ربهم لكافرون**"[٨٨] [واته: وە بێگومان زۆرێك لە خەڵكی باوەڕیان نیە بە خزمەت پەروەردگاریان بگەن –لە دوا ڕۆژدا–]. " **وما يؤمن أكثرهم بالله إلا وهم مشركون**"[٨٩] [واته: جا زۆربەیان باوەڕ ناهێنن بە خوا مەگەر ئەوان لەو كاتەدا هاوبەش بڕیار دەرن بۆ خوا]. " **ولكن أكثر النّاس لا يشكرون**"[٩٠] [واته: بەڵام زۆربەی خەڵك سوپاسی خوا ناكەن]. " **ولكن أكثر النّاس لا يؤمنون**"[٩١] [واته: بەڵام زۆربەی خەڵكی باوەڕ ناهێنن]. " **ولكن أكثر النّاس لايعلمون**"[٩٢] [واته: بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن]. " **فأبى أكثر النّاس إلا كفوراً**"[٩٣] [واته: وە زۆربەی خەڵكی جگە لە سپڵەیی و بێ باوەڕی هیچی تریان ناوێت].

ئەمە لە فەرمودەو فەرمایشتی خوایە كە –شتێكی– زۆرە.. وە لە فەرمودەی پێغەمبەریش ﷺ :" إنما النّاس كالإبل المائة لا تكاد تجد فيها راحلة " [واته: بێگومان خەڵكی وەك سەد وشتر وان زۆر بەگرانی و نارەحەتی وشترەكی سواریان تێدا دەدۆزیەوە] بوخاری و موسلیم و هی تر گێڕاویانەتەوە لە فەرموودەی عەبدوڵای كوڕی عومەر –خوا لە هەردووكیان ڕازی بێت–.. وە هەروەها لە بوخاریەوە لە ئەبو سەعیدی خودری لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی:" خوای گەورە دەفەرموێ:( ئەی ئادەم.. ناردەی ئاگر دەربهێنە) وتی: ناردەی ئاگر چیە؟ –خوای گەورە– فەرمووی:( لەهەر هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ)، ئالەو كاتەدا بچووك پیر دەبێت، وە هەموو سك پڕو دووگیانێكیش كۆرپەكەی دادەنێت و لەباری دەچێت، وە خەڵكی دەبینیت وەكو سەرخۆشن، لەڕاستیشدا سەرخۆش نین، بەڵكو سزای خوا زۆر سەخت و سامناكە" ئەمە شەرع و بەرنامەی خواو دینی خوایە

---

[٨٨] سورەتی (الروم) ئایەتی ٨.
[٨٩] سورەتی (یوسف) ئایەتی ١٠٦.
[٩٠] سورەتی (البقرة) ئایەتی ٢٤٣.
[٩١] سورەتی (الرعد) ئایەتی ١.
[٩٢] سورەتی (یوسف) ئایەتی ٢١.
[٩٣] سورەتی (الإسراء) ئایەتی ٨٩.

که گومڕایی زۆرینه و لادانیان ڕوون دەکاتەوە، هەربۆیەش خوای گەورە بڕیار دەدات و دەفەرموێ:" **إنِ الحكمُ إلا لله**"[٩٤] [واته: بێ گومان حوکم و بڕیار تەنها بۆ خوایە].

وە دیموکراسی و بانگخوازانی دیموکراسی قایل نابن و ڕازی نابن وە ملکەچ بوون بۆ حوکم و شەرعی خوا وەرناگرن و بەرپەرچی دەدەنەوەو عینادی و نکۆڵی دەکەن و دەڵێن:( بێگومان حوکم و بڕیار تەنها بۆ زۆرینەیە) جا فەوتاوی و دووری بۆ ئەوانەی شوێنیان دەکەون و لەسەر ڕێگاکەیان دەڕۆن وە بەسەر دیموکراسیەکەیان هەڵدەڵێن، جا هەرچەند ڕیشیشی درێژ بێت یان جلیشی کورت بێت، هەرکەسێك بێت... لە دونیادا پێیان دەڵێین بەڵکو تۆبە بکەن و دەگەڕێنەوە، چاکترە بۆیان و سوکترە لەوەی لە شوێنی وەستانی گەورە گوێیان لێبێ ئەو ڕۆژەی خەڵکی دەوەستن بۆ پەروەردگاری جیهانیان، جا دەیانەوێت بچن بۆ ئاوکۆ و حەوزی پێغەمبەر ﷺ و فریشتەکان ڕێگەیان لێدەگرن و دەوترێ: ئەوانە گۆڕیان، جا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:" سحقاً سحقاً لمن بدّل بعدي" [واته: دووری، دووری بۆ ئەوەی لە دوای من گۆڕی][٩٥]..

ئا بەم شێوە دیموکراسی بنیات و ماناکەی لە خۆڵ و خاك و زەمینی کوفرو بێ باوەڕی سەری هەڵداوەو لە سەرچاوەکانی شیرك و ناڕەوایی لە ئەوروپا گەورەبووەو پێگەیشتوە کە ئەوان دین و ئایینایان لە ژیان جیاکردەوە، ئەو دەستەواژە لەو کەش و هەواو بارودۆخە سەری هەڵدا کە هەموو ژەهرو ناڕەواییەکەی هەڵگرتووەو ڕەگەکەی هیچ پەیوەندیەکی نیە بە خاك و زەوی باوەڕ یان ئاودێری بیروباوەڕو چاکەوە.. وە لە دونیای ڕۆژئاوادا نەیتوانی بوونەکەی بچەسپێنێ مەگەر پاش ئەوەی لەوێ ئایین لە دەوڵەت جیاکرایەوە، جا نێربازی و زیناو مەی و تێکەڵاوکردنی ڕەگەزو خزمایەتی و بەدڕەوشتی تر لەوەی دیارەو و لەوەی نادیار بوو بۆی حەڵاڵ کردن و ڕێی پێدان... بۆیە مشتومڕو گفتوگۆ و ستایشی لەسەر ناکات و یەکسانی ناکات بە ڕاوێژ و شورا تەنها دوو کەس نەبێ

---

[٩٤] سورەتی (یوسف) ئایەتی ٤٠.

[٩٥] (سحقاً سحقاً) واتە: دووری بۆیان دووری. وە لەسەر چاوگەکە –المصدر– نەصبی کردووە، وە دووبارەی کردۆتەوە بۆ دڵنیاکردن و تەکیدکردنەوە. موسلیم (٢٢٩١) گێڕاویەتەوە، وە بوخاریش (٦٢١٢) بە دەقی: (سحقاً سحقاً لمن غيّر بعدي).

که سێیەمیان نیە، یان دیموکراسیەکی بێ باوەڕو کافر یان سووك و چروکێکی نەزان بە ماناو ناوەڕۆکەکەی..

**والله لستَ بثالثٍ لهما بلى إما حمـــاراً أو من الثـــيران**

ئێستاش سەردەمانێکە دەستەواژەکانی تێدا تێکەڵ بووەو شتە دژبەیەکەکانی تێدا کۆبوەتەوە، سەیر ئەوە نیە زۆرێك لە پشتیوانانی شەیتان بەسەر ئەو جۆرە ڕێبازو مەزهەبە کوفریانەدا هەربلێێن، بەڵام سەیر لەمەدایە زۆرێك لەوانەی خۆیان بۆ ئیسلام دەگێڕنەوە هانی —ئەم دیموکراسیە— بدەن و ڕێی پێبدەن وە بۆیەی شەرعی لەسەر تەواو بکەن.. تا دوێنێ کە خەڵك بە ئیشتراکیەت خەڵەتاو فریوی خوارد هەندێك لە خەڵکی لێمان دەرچوون بە بیدعەی ( ئیشتراکیەتی ئیسلام) و نەتەوە پەرست و ( قەومیەکان) عەرەبچیەکان وەریانگرت و لەگەڵ ئیسلام تێکەڵیان کرد.. وە ئەمرۆش زۆرێك لەوانە بەسەر دەستوورە زەمینیەکان هەردەڵێن و شەرم ناکەن لەناونانی بەندەکانی بە ( فەقیهەکانی قانوون) وەك لێچواندنێك بە ( فەقیهەکانی شەریعەت)، وە هەمان دەستەواژە شەرعیەکان بەکار دەهێنن، وەك موشەرریع و شەریعەت و حەلال و حەرام و جائیز و ڕێدراو (مباح) و قەدەغە ( محظور)، دواتر لەگەڵ ئەوەشدا پێیان وایە ئەوان لەسەر شتێکن و بگرە پێیان وایە ئەوان ڕێگای ڕاستیان گرتووە... جا هیچ هێزو توانایەك نیە تەنها بە خوای بەرزی گەورە نەبێ... بەخوا ئەمەش هیچ نیە تەنها ڕۆیشتن و نەمانی زانست و زانایان و فەرمان و کاروبار سپاردنە بە جگە لە خاوەنی خۆی و بەتاڵ بوونی کەش و بارو سەردەمە بۆ مرۆڤە بێ ئابڕووەکان کە چۆن لایان شیرین بێت ئاوا تێی دەگەوزن...

**خلا لكِ الجو فبيضي واصفري**

جا داخ و حەسرەت بۆ زانست و زانایان، وە زۆر ئەسەف و خەفەت بۆ ئەو ئایین و بانگخوازە خواییە دڵسۆزەکان... بەخوا ئەمە زۆر نامۆو غەریبە، غەریبایەتیەك کە وێنەی نیە، وە ناڵێم لە نێو خەڵکی ڕەش و ڕووت و عامـمی بەڵکو لە نێوان زۆرێك لەوانەی دەگەڕێندرێنەوە بۆ ئیسلام لەوانەی لە واتای (لا إله إلا الله) ناگەن، وە واجبات و پێویستیەکان و مەرجەکانی نازانن، بگرە زۆربەیان بە شەو و بەڕۆژ هەڵیدەوەشێنێتەوە، وەخۆیان لە شیرکی هاوچەرخ و هۆکارەکانیەوە گلاندوەو دواتریش پێیان وایە ئەوان

یەکتاپەرستن و بگرە پێیان وایە ئەوان لە بانگخوازانی یەکتاپەرستین، با بەخۆیاندا بچنەوەو لە کۆڕی زانستدا دابنیشن بۆ ئەوەی ڕاستەقینەیی (لا إله إلا الله) فێربن، چونکە ئەمە یەکەم شتە لەسەر نەوەکانی ئادەم پێویست کراوە فێری بن، وە بۆ ئەوەی فێری مەرجەکانی و هەڵوەشێنەرەوەکانی بن پێش ئەوەی هەڵوەشێنەرەوەکانی دەستنوێژو نوێژ –فێربن– چونکە نە دەستنوێژێك و نە نوێژێکی دروست نابێ ئەوەی کە هەڵیان دەوەشێنێتەوە... جا ئەگەر پشتیانکردو فیزیان لێدا ئەوە بەمەیان تەنها خۆیان زەرەرمەندن..

وە کۆتا –بە قسەکانم دەهێنم– بە وتەیەکی بەنرخ و گران بەهای زانای بلیمەت ئەحمەد شاکر –ڕەحمەتی خوای لێبێ– کە تیایدا بەرپەرچی هاوشێوەی ئەو پۆشەرانە دەداتەوە کە فەرمودەی خوا دەگۆڕن و تەحریفی دەکەن و بوختانی درۆی لەسەر دەکەن –پاکی بۆ خوا– بە بەڵگەهێنانەوەیان بە فەرمایشتەکەی –خوای– پاك و گەورە:" **وأمرهم شورى بينهم**"[96] [واتە: وە کارو باری نێوانیان بە پرس و مەشوەرەتە]. بۆ سەرخستن و جێبەجێکردنی دیموکراسیەتی کافر.

کە لە پەراوێزی ( عمدة التفاسير)[97] دا لە کاتی ڕاڤەکردنی فەرمایشتی خوای گەورە:" **وشاورهم في الأمر**"[98] [واتە: وە ڕاوێژیان پێ بکە لە کارو باردا]. وە ئایەتەکەی تر" **وأمرهم شورى بينهم**" [واتە: وە کارو باری نێوانیان بە پرس و مەشوەرەتە] –خوا ڕەحمی پێبکات– دەڵێ:( لەو سەردەمەدا ئەوانەی گەمە بە ئایین دەکەن – لە زانایان و هی تریش– ئەم دوو ئایەتەیان کردوە بە کۆمەکی لە گومڕاکردن بە تەئویل کردنیان، بۆ ئەوەی کۆببنەوە لە کاری ئیفرەنج لە ڕێبازی نیزامی دەستووری ئەوەی گومانی بۆ دەبەن وە ئەوەی خەڵکی پێ دەخەڵەتێنن بە ناونانی " نیزامی دیموکراسی" جا ئەو گەمەچیانە لەو دوو ئایەتە دروشمێکیان هێناوەتە بوون، کە گەلانی ئیسلامی یان ئەو گەلانەی بۆ ئیسلام دەگەڕێندرێنەوە پێ دەخەڵەتێنرێن. وتەیەکی ڕاست و حەق دەڵێن کە مەست پێی نارەوایی و باتیلە، دەڵێن:( ئیسلام فەرمان بە ڕاوێژو شورا دەکات) وە هاوشێوەی تر لە دەستەواژەکان.

---

(96) سورەتی (الشورى) ئایەتی ٣٨.

(97) عمدة التفسير: بەرگی٣ پەراوێزی ژمارە ٦٤–٦٥.

(98) سورەتی (آل عمران) ئایەتی ١٥٩.

وه لەڕاستیدا ئیسلام فەرمان دەكات بە شورا. بەڵام چ شورایەكە ئیسلام فەرمانی پێدەكات؟ خوای گەورە بە پێغەمبەرەكەی ﷺ دەفەرموێ:

" **وشاورهم في الأمر فإذا عزمتَ فتوكل على الله** " [واتە: وە ڕاوێژیان پێ بكە لە كاروباردا، جا كاتێ –دوای ڕاوێژكردن– بڕیارت دا ئەوە پشت بە خوا ببەستە) بڕیارت دا پشت بەخوا ببەستە]. وە مانای ئایەتەكە ڕوون و بێ خەوشە، پێویستی بە ڕاڤەكردن نیە، وە هیچ تەئویلێك هەڵناگرێ، ئایەتەكە فەرمانێكە بۆ پێغەمبەر ﷺ، دواتر بۆ ئەوەی دەبێتە گەورە و وەلی ئەمر لەدوای ئەو: كە بۆچوونی هاوەڵەكانی بخاتەڕوو،ئەوانەی بەخاوەن بۆچوون دەیانبینێ، ئەوانەی كەوا میهرەبان و هۆشیارو ژیرەكانە، لەو باسانەی كە جێگەی گۆڕینەوەی بۆچونەكانە و جێگەی لێكدانەوەیە (ئیجتیهادە) لە جێبەجێكردندا. پاشان ئەوەی لە نێوانیاندا بە ڕاست و دروست یان بە بەرژەوەندی دەبینێ هەڵیدەبژێرێ، جا سووردەبێ لەسەر جێبەجێكردنی، بەبێ ئەوەی پابەند بێت بە بۆچوونی گروپێكی دیاریكراو، وە –بەبێ ئەوەی پابەند بێت بە– بۆچوونی ژمارەیەكی دیاریكراو، نە بە بۆچوونی زۆرینە، وە نە بە بۆچوونی كەمینە، جا ئەگەر بڕیار بدا پشت بە خوا دەبەستێ، وە ئەو بڕیارە جێبەجێ دەكات لەسەر ئەوەی دەیبینێ.

وە لە تێگەیشتنێكی بەڵگە نەویستەو پێویستی بە بەڵگە نیە: بێگومان –كە خوا– فەرمانی بە پێغەمبەرەكەی كردووە تا ڕاوێژیان پێ بكات– وە ئەوانەی گەورایەتی و وەلی ئەمری دەگرنە دەست لەدوای ئەو شوێن كەوتەی دەكەن لەمەدا – بریتین لەو لە پیاوە چاكانەی كە وەستاون لەسەر سنوورەكانی خوا – وجێبەجێ دەكەن–، ئەوانەن لەخوا دەترسن، نوێژ دەكەن، زەكات دەدەن، تێكۆشەرن لە پێناوی خوادا، ئەوانەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەیانەوە دەفەرموێ:" لِيلِني منكم أولو الأحلام والنهى" [واتە: با لە ئێوە كەسانی هۆشمەندو پێگەیشتوو و هۆشیارو ژیر لە من نزیك ببنەوە]. ئەوان بێ باوەڕو مولحیدەكان نین، وە شەڕكەرەكان نین بۆ ئایینی خوا، وە ئەو خراپەكارانە نین كە خۆیان ناپارێزن لە هیچ كاروكردارێكی نابەجێ، وە ئەوانەش نین كە پێیان وایە بۆیان هەیە یاساو قانونی دابنێن كە پێچەوانەی ئایینی خوا بێت، وە بەرنامەو ڕێبازی ئیسلام دەڕوخێنێ، ئەوانەو ئەوانە – لە

نێوان کافرو خراپەکاردا- شوێنی دروستیان ژێر شمشێرە یان قامچیە، نەوەك ڕاوێژو گۆڕینەوەی بۆچوونەکان.

وە ئایەتەکەی تریش، ئایەتی سورەتی (الشوری) وەك وێنەی ئەم ئایەتە وایە لە ڕوونی و ئاشکرایی و بیٚ خەوشیدا:" **والذین استجابوا لربهم وأقاموا الصلاة وأمرهم شوری بینهم ومما رزقناهم ینفقون** " [واتە: وە ئەوانەی کە گوێڕایەڵی پەروەردگاریان کردووە، وە نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجامداوە، وە کاروباری نێوانیان بە پرس و مەشوەرەتە، وە لەو ڕۆزیەی پێمان داون دەیبەخشن]. اهـ

# گومانی چوارەم

# بەشداری کردنی پێغەمبەر ﷺ لە پەیمانی (فضول)دا

ئەمەو چەند گەوج و گەمژەیەکیان بەشداری کردنی پێغەمبەریان ﷺ لە پەیمانی (فضول)دا پێش ناردنی —بە پێغەمبەر— کردۆتە بەڵگە بۆ ڕەواکردنی بەشداری کردن لە پەرلەمانەکانی یاسادانانی شیرکیدا.

جا دەڵێین وە تەوفیقیش لای خوایە:—

بەڕاستی ئەوەی ئەم گومانەی کردۆتە بەڵگە یان ئەوەتە نازانێ پەیمانی (فضول) چیە، جا ووڕێنە دەکات بەوەی نایزانێ وە قسە دەکات لەوەی نایزانێ.. یان ئەوەتە ڕاستیەکەی دەزانێ و ئینجا ڕاستی تێکەڵ بە نارەوایی دەکات لەسەر خەڵکی بۆ ئەوەی ڕووناکی بپۆشێ بە تاریکی و شیرکیش بە ئیسلام.. ئەمەش لەبەر ئەوەی، هەروەك (ئیبن ئیسحاق) لە ژیاننامەکەیدا وە (ئیبن کەثیر)[99] وە (قورطوبی)یش لە تەفسیرەکەیدا[100] وە هی تریش باسیان کردووە، کە پەیمانی (فضول) پێکهات لەوکاتەی ( چەند هۆزو تیرەیەك لە قورەیش لە ماڵی عەبدوڵای کوڕی جودعان کۆبوونەوە — لەبەر پایەبەرزی و ڕەچەڵەکەکەی— ، بەڵێن و پەیمانیاندا لەسەر ئەوەی لە مەککەدا ستەم لێکراوێکی خەڵکی مەککە یان هی تر نەدۆزنەوە ئیللا ئەوە لەگەڵی هاڵساون تاوەکو مافەکەی بۆ دەگەڕێندرێتەوە، جا قورەیش ناوی ئەم پەیمانەی نا بە پەیمانی (فضول). واتە پەیمانی چاکەکان) اهـ.

وە ئیبن کەثیر دەڵێ:( پەیمانی (فضول) بەڕێزترین و پایەبەرزترین پەیمان بووە کە لە نێو عەرەبەکاندا بیستراوە، وە یەکەم کەس کە قسەی لێکردو بانگی بۆ کرد (زوبەیری کوڕی عەبدولموطەللیب) بوو، هۆیەکەشی ئەوەبوو کە پیاوێك لە زوبەیدیەکان بە هەندێ

[99] البداية والنهاية: بەرگی ٢ لاپەڕە ٢٩١.

[100] الجامع لأحكام القرآن: (٦/٣٣)، (١/١٦٩).

کەلوپەلەوە هاتە مەککە، جا (عاصی کوڕی وائیل) لێی کڕی و حەقەکەی نەدایێ، زوبەیدیەکەش چەند هۆزێك لە هاوپەیمانەکانی لەسەر بانگ کرد، ئەوەبوو ڕەتیان کردەوە یارمەتی بدەن لەسەر (عاصی کوڕی وائیلدا)داو زوبەیدیەکەیان توڕەکرد، کاتێ زوبەیدیەکەش ئەم خراپەیەی بینی، لەگەڵ خۆرهەڵاتدا بەسەر چیای ئەبی قوبەیس کەوت، وە قورەیشیش لە یانەکانیاندا بوون لە دەوری کەعبەدا ، بە هەموو دەنگی خۆی بانگی کرد:-

یا آل فهرٍ لمظلــومٍ بضـاعتـــه ببطنِ مكة نائــــي الـدار والنفـرِ
ومحرمٍ أشعــثٍ لم يقـضِ عُمرته يا للرجال وبين الحِجْر والحَجـرِ
إنَّ الحرام لمن ماتت كرامتـــه ولا حرامٌ لثـوب الفاجـر الغـــــدرِ

جا بۆ ئەمە زوبەیری کوڕی عەبدولموطەللیب هەڵساو گوتی: ئەمە چیەتی بۆ وازی لێهێنراوە؟ جا هاشم و زوهرەو تەیمی کوڕی مورە لە ماڵی عەبدەلای کوڕی جودعان کۆبوونەوە، - خاوەن ماڵیش- خواردنێکی بۆ دروست کردن و هاوپەیمانیان بەست لە ذیلقیعدەدا لە مانگی حەرامداو بەڵێن و پەیمانیان بە خوادا کەبن بەیەك دەست لەگەڵ ستەملێکراودا لەسەر ستەمکار تاوەکو مافەکەی بۆ دەگێڕێتەوە تاوەکو دەریا پارچە خوریەك تەڕ دەکات و "سەبیر" و "حەرا"ش[٩٨] دەچەسپێن لە شوێنی خۆیاندا وەلەسەر یارمەتی دان موچەو بژێوی ژیانیاندا، جا قورەیش ئەو پەیمانەی ناونا بە پەیمانی (فضول)، وە وتیان بەڕاستی ئەوانە چونەتە نێو چاکەو پیاوەتیەك لەکاروباردا، دواتر بۆ لای (عاصی کوڕی وائیل) چوون و شتومەکەکەی زوبەیدیەکەیان لێ سەندەوەو بۆیان گەڕاندەوە. وە (قاسمی کوڕی ثابیت) لە (غريب الحديث) دا باسی کردووە کە: پیاوێك لە خەثعەم بۆ حەج -یان بۆ عومرە- هاتوە بۆ مەککە وە کچێکی لەگەڵدا بووە کە پێی دەوترا (قەتول) لە پاکترین و بە شەوقترینی ژنانی جیهان بوو، ئەوەبوو (نەبیهی کوڕی حەججاج) بە زۆری لێی سەندو لێی شاردەوە، جا خەثعەمیەکە وتی: کێ یارمەتیم دەدات لەسەر ئەو پیاوە؟ پێیان وت: بڕۆ بۆ لای هاوپەیمانانی (فضول)دا، ئەویش لای کەعبە وەستاو بانگی کرد: ئەی هاوپەیمانانی (فضول): لەوکاتدا لەهەموو لایەکەوە بەرەو پیری هاتن، وە شمشێرەکانیان لە کاڵانەکانیان دەرهێنابوو

---

[٩٨] ناوی چیان لە مەککە.

و دەيانوت: يارمەتی و پشتگيريت بۆ هات چيتە؟[١٠٢] جا وتی: بەڕاستی نەبيھ ستەمی لێكردووم لە كچەكەمەوەو بە زۆرەملێیٚ و بە ناچاری لێی سەندووم، ئەوەبوو لەگەڵی ڕۆيشتن تاوەكو لەسەر دەرگای ماڵەكەی وەستان، ئەويش لێيان هاتە دەر، پێيان وت: قوڕبەسەر ئەو كچە بێنە دەرەوە! چاك دەزانی ئێمە كێين و پەيمانمان لەسەر چی داوە، ئەويش وتی: وادەكەم. بەڵام با ئەمشەو لەزەتی لیٚ بكەم، وتيان: " لا ولا شَخْبُ لقحة"[١٠٣] [واتە: نا بە ئەندازەی دۆشينی حوشترێكی فرە شيريش نا]، ئينجا كچەكەی بۆ هێنانەوە..

وە زوبەيری لەبارەی پەيمانی (فضول) دەڵێیٚ:

إنَّ الفضول تعاقـــدوا وتحالفوا     ألا يُقيم ببطن مكـــــة ظالمُ

أمرٌ عليه تعاقدوا وتواثقـــوا     فالجارُ والمُعْتـــَرُّ فيهمُ ســـالمُ[١٠٤]

جا لەو پەيمانەو لەدەوری ئەو مەبەستانە دادەبەزێنریٚ ئەو –فەرمودەيەی– ئەو گەلە دەيكەنە بەڵگە لەوەی (بەيهەقی) و (حومەيدی) گێڕاويانەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی:" شهدتُ في دار عبد الله بن جُدعان حِلفاً ما أُحب أن لي به حمر النَّعم[١٠٥] ولو أُدعَى به في الإسلام لأجبت " [واتە: لە ماڵی (عەبدوڵای كوڕی جودعان) پەيمانێكم ديوە بەلامەوە لە حوشترە سووركەڵەكان خۆشترە، ئەگەر لە ئيسلامەتيشدا بۆی بانگ بكرێم، بەدەميەوە دەڕۆم و وەڵامی دەدەمەوە].

---

[١٠٢] ئاگادار بە: ئەگەر ئێمە ئەمەمان كردبايە بەڵگە لەسەر ڕەوايی ڕێكخستنی گروپێك يان كۆمەڵە گروپێكی چەكدار بۆ سەرخستنی ستەملێكراو نكۆڵی كردن لە خراپە بە دەست، جا ئەگەر دەولەتی ئيسلاميش نەبوو و پێشەوا –ی موسولمانان– نەبوو، بە بەڵگەی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ستايشی ئەو پەيمانەی كردووەو مەدحی كردووە لەگەڵ ئەوەی ئەو لەكاتی دەولەتی كوفردا –ئەو پەيمانە– بەسترا و پێشەوايەك نەبوو.. دەڵێم: ئەگەر ئێمە ئەو بەڵگەيان بكەينە بەڵگە لەوباسەدا ئەوە بە بيدعەچيمان دادەناين و چەندين هێرش و پەلاماريان دەكردينە سەر وە قسەی ناشيرينيان پیٚ دەگوتين.. بەڵام كردنی بەبەڵگە لەسەر ڕەوايی سوێند خواردن لەسەر ڕێزگرتنی شيرك و بەژداری كردن لە ياسادانان بەگوێرەی دەستووری ئيبليس و جگە لەمانەش لە گومراييەكان و شيركيات و دەرچوونەكانيان، جا ئەوە كارێكە عەقلە پكاوەكانيان ڕێی پیٚ دەدات.. جا دووری بۆيان دووری.

[١٠٣] ولا شخب لقحة: واتە بە ئەندازەی كاتی دۆشينی حوشترێكيش نا.

[١٠٤] لە پەرتوكی: البداية والنهاية للحافظ"ی كەڵەزانا (ئيبن كەثير).

[١٠٥] لە باشترين و چاكترين جۆرەكانی حوشترە لای عەرەب.

هەر بۆیە (حومەیدی) – لە فەرمودەکەی سەرەوە– زیاتری گێڕاوەتەوە:" تحالفوا أن يردوا الفضول على أهلها وألا يعِد ظالمٌ مظلوماً" [واتە: هاوپەیمانی بکە بۆ ئەوەی چاکەکان و ماڵە داگیر کراوەکان بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان، وە تاوەکو هیچ ستەمکارێك هەڕەشەو گوڕەشە نەکاتە سەر هیچ ستەملێراوێك].

جا ئێمە ئا لێرەدا پرسیار لەو قەومە دەکەین و دەڵێین:–

– ئەی تێگەیشتوان و ئەوانەی دەزانن بەڵگە بهێننەوە ڕووی بەڵگە لەم پەیمانەو ئەوەی تێیدایەتی لە چاکەو پیاوەتی لەکوێیە لەسەر ڕەوابوون و جائیز بوونی چوونە نێو کۆڕو ئەنجومەنێك کە یاساو دەستووری تێدا دادەنرێ لەگەڵ خوا بەگوێرەی دەستووری ئیبلیس، وە دانیشتوانی کۆڕو ئەنجومەنەکە ئەو کۆڕو ئەنجومەنەیان دەکەنەوە بە سوێند خواردن لەسەر ڕێزگرتن لە کوفرو قانوونەکانی و –وە سوێند دەخۆن لەسەر– پشتگیریکردن بۆ بەندەکانی و طاغووتە شەڕەنگێزەکانی بۆ ئایینی خواو پشتیوانانی، ئەوانەی پشتیانکردووە لە دوژمنانی خواو کوفرەکانیان..؟؟

– ئایا لە پەیمانی (فضول)دا کوفرو شیرك و یاسادانان لەگەڵ خواو ڕێزگرتن لە دین و ئاینێك جگە لە دین و ئاینی خوا هەبوو، تاوەکو بەڵگەکردنی دروست بێت..؟؟

ئەگەر وتتان بەڵێ.. کەواتە ئێوە پێتان وایە پێغەمبەر ﷺ بەشداری کردووە لە کوفرو یاسادانان و شوێن ئایینێك کەوتووە جگە لە ئایینی خوا، وە ئەگەر لە ئیسلامدا بانگ بکرێ بۆ هاوشێوەی ئەمە وەڵامی دەدایەوە!! ئەو کەسەی ئەمەی پێوابێت ئەوە جنۆکەو مرۆڤەکان شایەتن لەسەر کوفرەکەی و هەڵگەڕانەوەکەی و زندیقیەکەی..

وە ئەگەر وتتان: نەخێر، نە کوفری تێدا بوو وە نە یاسادانان وە بگرە خراپەیەکیش لە خراپەکانی تێدا نەبوو... وەگشت ئەوەی تێیدا بوو بریتیی بوو لە سەرخستنی ستەم لێکراو و بەهانا هاتنی دڵگیر و سەروماڵ تیاچوو وە شتی تر لە چاکەو پیاوەتیەکان..

کەواتە ئێوە چۆن بەراوردکردنی –پەیمانی (فضول)– لەسەر کۆڕو ئەنجومەنەکانی کوفرو خراپەکاری و سەرپێچی حەڵاڵ و جائیز دەکەن..؟؟

- پاشان ئێمە پرسیاریان لێدەکەین، پرسیارێکی ڕوون، وە شایەتیەکی ڕوونمان لێیان دەوێت لەسەر پێغەمبەری خواﷺ لە وەڵامی ئەو پرسیارە:" **سَتُكْتَبُ شَهادَتُهُم وَيُسئَلون**"[١٠٦] [واتە: بێگومان شایەتیەکان دەنوسرێت و پرسیاریشیان لێ دەکرێت].

ئەگەر بەشداربوو لەو پەیمانی (فضول)ەدا، صیفەتی هەرچۆن بێت - مەبەستم پەیمانەکەیە-، کەس ناتوانێت بەشداری تێدا بکات ئیللا ئەگەر لەدەستپێکی چوونە نێو هاوپەیمانیەکە سوێند بخوات لەسەر ڕێزگرتنی لات و عوززاو مەناتی سێیەمیش - وەسوێند بخوا لەسەر- پشتیوانی کردن و سەرخستنی ئایینی قورەیشی کوفری و بتەکانی و نەزانیەکەی.. ئینجا لەسەر سەرخستنی ستەم لێکراو و بەهانا هاتنی ئازار پێگەیشتوو و خەم خواردوو... وە هاوشێوەی ئەمانە..

دەڵێم: ئەگەر بارودۆخەکە ئاوا بوایە.. پێغەمبەر ﷺ بەشداری تێدا دەکرد یان وەڵامی دەدایەوە ئەگەر لە ئسلامدا بانگ بکرابایە بۆ هاوشێوەکەی..؟؟

وەڵاممان بدەنەوە ئەی خاوەن بەرژەوەندیەکان و بەچاکزانینەکان..!! وە ئەی خاوەن ئاهەنگ و ڤیستیڤاڵەکان..!!

ئەگەر وتیان: بەڵێ وەڵامی دەدایەوەو بەشداری تێدا دەکرد.. وە هەر ئاواش بوو.. ئەوە ئوممەت گشتی خۆیان لێ بەری کردووە و وەگشت دروستکراوەکان شایەتی دەدەن لەسەر کوفریان..

وە ئەگەر وتیان: نا، پاکی بۆ -پێغەمبەر ﷺ- لەمە...

دەڵێین: کەواتە ئێوە لەو درۆو چەنەبازی و زۆربلێییە بگەڕێن و بزانن بەڵگەهێنانەوە چۆن و بەچی دەبێت..

---

[١٠٦] سورەتی (الزخرف) ئایەیت ١٩.

# گومانی پێنجەم
# بەرژەوەندی بانگەوازی

دەڵێن: بێگومان چوونە نێو ئەو ئەنجومەنە بەرژەوەندی زۆری تێدایە، بگرە هەندێکیان پێیان وایە ئەو ئەنجومەنە لە بنچینەدا بەرژەوەندیەکی مورسەلە، وە –لەوانەی– باسیان کردووە: بانگەوازی بۆ خوا، وە وتنی وشەی حەق و ڕاستی، وە –لەوانەی– باسیان کردووە: گۆڕینی هەندێك لە خراپەکان و سوك کردنی هەندێك لە پاڵەپەستۆکان لەسەر بانگەوازی و بانگخوازان... وە –لەوانەی– باسیان کردووە: وازنەهێنان و جێنەهێشتنی ئەو شوێن و ئەنجومەنانە بۆ گاورو شیوعیەکان و هاوشێوەیان... وەهەندێکیان زیادەڕۆیان کردووەو باسی ئەوەی کردووە: بەرژەوەندی فەرمانڕەوایی کردنی شەرع و بەرنامەی خواو هەڵسانەوەی ئاینەکەی لە ڕێگای ئەم ئەنجومەنانە... وە هاوشێوەی تر لە بەچاکزانینەکان و خەونەکان و ئارەزوکانیان.. وە گشت ئەوەی لەو باسەدایە لەدەوری بەرژەوەندی دەخولێتەوە... [١٠٧].

ئێمەش دەڵێین وە تەوفیقیش لای خوای گەورەیە:–

سەرەتا پرسیاریان لێدەکەین و دەڵێین:–

– کێیە بەرژەوەندیەکانی ئایینەکەی و بەندەکانی دیاری دەکات و بەچاکی دەیزانێ؟؟ خوای بە سۆزو کارامەو شارەزا؟؟ یان ئێوە بە چاکزانین و بە باش زانینەکانتان؟؟

* جا ئەگەر وتیان: ئێمە.

---

[١٠٧] فەتوایەکی کەڵە زانای ئیسلام لەو باسەدا هەیە کە تیایدا هاوشێوەی ئەو بەچاکزانین و بەباش زانینە پوچ و ناڕەوایانە بە بیانوی بەرژەوەندی بانگەوازی پوچەڵ دەکاتەوە... ئێمەش ساخمان کردۆتەوەو ڕوونکردنەوەیەکمان لەسەری داناو وە چەند پێشەکیەکی گرینگمان خستە پێشی و ناومان نا:( القول النفیس فی خدیعە إبلیس)، جا ئەوەی زیاتری لەو باسە دەوێت با بۆی بگەڕێتەوە.

وە براکانمان لە (نور) بۆ ڕاگەیاندنی ئیسلامی لە دانیمارك هەڵسان بە چاپکردنی و تۆمارکدنی لەسەر کاسێتی بیستراودا.

– دەڵێین: کەواتە ئایینەکەتان بۆخۆتان و وە بۆ ئێمەش ئایینی خۆمان، ئێمە هەرگیز ئەو شتە ناپەرستین کە ئێوە دەیپەرستن، وە ئەوەی ئێمە دەیپەرستین ئێوە ناپەرستن... چونکە خوا –باسکردن و ناوهێنانی هەردەم بەرز شکۆدار بێت– دەفەرموێ:" **ما فرطنا في الكتاب من شيءٍ**"[108] [واتە: هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردووە لەم کتێبەدا– لوح المحفوظ یان قورئان–].

وە وەك ئینکاری و نارەزایی و ناقایلیەك لەسەر ئەو دیموکراسیانە و هاوشێوەکانیان دەفەرموێ:" **أيحسبُ الإنسان أن يُتْرك سدىً**"[109] [واتە: ئایا ئادەمیزاد وا دەزانێت هەروا بەرەڵا دەکرێت و –پشت گوێ دەخرێت–]. وە دەفەرموێ:" **أفحسبتم أنما خلقناكم عبثاً**"[110] [واتە: ئایا ئێوە گومانتان وا بوو کە بێگومان ئێمە ئێوەمان بەبێ هودە دروست کردووە]..

وە ئەمە لە دین و ئاین و میللەت و ڕێبازی ئێمەیە... بەڵام لە دین و ئایینی دیموکراسی و ڕێبازەکەی هیچ شوێنێك بۆ ئەو ئایەتە پتەو و قایمانە نیە، چونکە مرۆڤ لایان بریتیە لە یاسادانەر بۆ خۆی... جا ئەوان دەڵێن: بەڵێ مرۆڤ بە خۆڕایی جێهێشتراوەو ئازادیەکی ڕەهای هەیە لەوەی لە یاسادانان و ئاییندا چی دەیەوێ هەڵیبژێری و بڕیاریبدا و جێبهێڵێ و بیچەسپێنێ... وە –لای– گرنگ نیە ئەگەر ئەو یاسایەی دایدەهێنێ گونجاو تەبا بێ لەگەڵ ئەوەی لە پەرتووکی خوادا هەیە یان دژ بێت بۆی... بەڵام ئەوەی گرنگە دژی دەستوورو قانون نەکات...

" **أفٍّ لكم ولما تعبدون من دون الله أفلا تعقلون**"[111] [واتە: ئۆف بۆ ئێوەو بۆ ئەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، دەی ئایا ژیر نابن –بیرو هۆشتان ناخەنەکار–؟!].

* وە ئەگەر وتیان: بەڵکو تەنها خوایە –باسکردن و ناوهێنانی هەردەم بەرز شکۆدار بێت– کە سنوورەکان دیاری دەکات و بەرژەوەندیەکان بەچاکترین ئەندازە دیاری

---

[108] سورەتی (الأنعام) ئایەتی ٣٨.

[109] سورەتی (القیامة) ئایەتی ٣٨.

[110] سورەتی (المؤمنون) ئایەتی ١١٥.

[111] سورەتی (الأنبیاء) ئایەتی ٦٧.

دەكات، چونكە هەرئەوە بوونەوەری دروست كردووە، وە هەر ئەو زاناترە بە بەرژەوەندیەكانیان " **ألا يعلمُ من خلقَ وهو اللطيف الخبير**"(١١٢) [واتە: ئایا خوا نازانێت كێی دروست كردووە و چۆنی دروست كردووە، لە كاتێكدا ئەو وردبین و ئاگادارە].

– پرسیارمان لێیان كرد: ئەی گەورەترین بەرژەوەندی لە بووندا چیە، كە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بڕیاری لەسەر داوەو لە پێناویدا پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانە كردووە، وە پەرتووكەكانی بۆ ناردووە، وە جیهاد و شەهیدبوونی لەپێناویدا داناوە، وە لەپێناویشیدا دەوڵەتی ئیسلامی دادەمەزرێت... ئەی بانگخوازانی خەلافەت؟؟؟

* ئەگەر لە بەرژەوەندیە بچووكە لاوەكیەكاندا سەریان لێ تێكچوو و لە بنچینەی بنچینەكان لایاندا.

– پێیان دەڵێین: لەو ڕێنەو قسە بێ مانایانە بگەڕێن و دابنیشن و فێری بنچینەی ئایینەكەتان بن، فێری واتای (**لا إله إلا الله**) بن كە نە بانگەوازی و نە جیهاد و نە شەهیدبوونێك بەبێ جێبەجێكردنی و زانینی واتاكەی وەرناگیرێ...

* وە ئەگەر وتیان: گەورەترین بەرژەوەندی لە بووندا بریتیە لە: پاككردنەوەی یەكتاپەرست بۆ خوای گەورەو دوركەوتنەوەیە لە دژەكانی و هەڵوەشێنەرەوەكانی لە شیرك و هاوشێوەدانانادا..

– دەڵێین: ئەی ژێرمەندان دەچێتە ئەقڵەوە!! ئەو بەرژەوەندیە گەورەیە گشتیە یەكلایكراوەو بڕاوە بڕوخێنن، وە لەگەڵ طاغوتەكاندا لەسەر ئایینێك جگە لە ئاینی خوا (دیموكراسی) ڕێك بكەون، وە قەبولی بەرنامەیەك بكەن و ڕێزی لێ بگرن جگە لە بەرنامەكەی خوای گەورە ( دەستوور)، وە شوێن چەند پەروەردگارێكی یاسادانەری لەیەكتر جیاواز بكەون لەگەڵ خوای تاكی بەدەسەڵات..؟؟

بەمە گەورەترین بەرژەوەندەی بڕوخێنن لە بووندا كە بریتیە لە یەكتاپەرستی و كوفركردن بە طاغووتەكان... بۆ چەند بەرژەوەندیەكی لاوەكی بچووكی گوماناوی ناپەسندو ناشیاو (مرجوح)؟؟

---

(١١٢) سورەتی (الملك) ئایەتی ١٤.

چ تەرازویەك وە چ عەقڵێك وە چ شەرع و بەرنامەیەك وە چ ئایینێك بەمە ڕازیە مەگەر ئایینی دیموکراسی کوفری نەبێت؟؟

– وە چۆن هەندێکتان دەوێرن گومانی وا ببەن کە ئەو ئەنجومەنە شیرکیانە لە (بەرژەوەندی مورسەلە)دایە.. بەرژەوەندی مورسەلیش لای ئەوانەی کە باوەڕیان پێیەتی:( ئەوەیە کە شەرع شایەتی بۆ نەداوە، نەبە بایەخ پێدانی، وەنە بە هەڵوەشاندنەوە – وقەدەغەکردنی–) جا پێتان وایە کە شەرعی خوا شیرك و کوفری پوچەڵ نەکردۆتەوە، وە گشت ئایینێکی پوچەڵ نەکردۆتەوە کە ئاینی ئسلام هەڵدەوەشێنێتەوە، وە گشت ڕێبازێك کە ڕێبازی یەکتاپەرستی هەڵدەوەشێنێتەوە – بەتاڵ نەکردۆتەوە–...؟؟

– دواتر ئەوە چ بانگەوازێکە کە پێتان وایە دەیلێین وە ئەوە چ ڕاستی و حەقێکە کە پێتان وایە دەیدرکێنن لەو ئەنجوومەنە شیرکیانە پاش ئەوەی بنچینەی بنچینەکانی بانگەوازی ئیسلامی و جەمسەری دەستاڕی حەق و ڕاستی ئاشکراو ڕوونتان ناشتووەو پۆشیوە؟؟ وە ئایا ئەو بنچینە پتەوەو بەرژەوەندیە گەورەترینە دەپۆشرێت و لەگۆڕ دەنرێ تاوەکو لەسەر حیسابی ئەو مشتومڕی شتە بچووکەکان و لق و پۆپەکانی ئاین بکرێ...؟؟

– دواتر کاتێ موناقەشەی ئەو شتە بچووك و لق و پۆپانە دەکەن –هەروەك ئەوەی هەوڵدەدا بۆ قەدەغە کردنی ئارەق– لە داواکانتان بۆحەرامکردنی بەچی پاڵپشتی دەکەن وە بەچی بەڵگە دەهێننەوەو بەچی قسە دەهێننەوە..

ئایا دەڵێن: خوا فەرموی وە پێغەمبەرﷺ فەرموی؟؟

پاشان ئەگەر گومانتان وابرد درۆتان کرد، چونکە ئەوە هیچ نرخ و بایەخێکی بۆ نیە لە ئایینی دیموکراسی و شەرعی دەستووردا، مەگەر ئەوەی دەستوور شایەتی بۆ داوەو نرخی بۆ داناوەو زاڵی کردووە بەسەریدا... بێگومان ئێوە دەڵێن: ماددەی دووەم دەڵێ.. وە ماددەی ٢٤... وە ماددەی ٢٥... وە هاوشێوەی تریان لە یاساکانی کوفرو گومڕایی... جا ئایا لەپاش ئەمە کوفرو شیرك و ئیلحادێکی تر هەیە؟ وە ئایا ئەوانەی ئەم ڕێگایەیان گرتۆتە بەر هیچ بنچینەیەك و ڕێبازێك و یەکتاپەرستیەکیان بۆ دەمێنێ..؟؟

" أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً

**بَعِيداً"**[113] [واته: ئایا نەتڕوانیوەتە ئەوانەی وا خۆنیشان دەدەن کە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی دابەزیوە بۆ تۆ –کە قورئانە– وە بەوەش کە پێش تۆ دابەزیوە، دەیانەوێت – بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان– دادوەری بەرن بۆ لای طاغوت، لە کاتێکدا بەڕاستی فەرمانیان پێدراوە کوفری پێ بکەن، وەشەیتان دەیەوێت گومڕایان بکات بە گومڕاییەکی دوور لەڕاستی].

وەلاممان بدەنەوە.. ئایا دەکرێ قانونێك یان یاسایەك لەو خەلۆەتگا بتپەرستیانە دابنرێت –بە ڕێگایەك– جگە لەم ڕێگا شیرکیە کوفریانە..؟؟

وەلاممان بدەنەوە ئەی خاوەن بەچاك زانینەکان و تێگەیشتووەکان..؟؟

وە بگرە حوکم و فەرمانڕەوایی کردنیش بەوەی خوا دایبەزاندووە گشتی کە ئێوە لەسەری دەگرێین. دەتانەوێ لەو ڕێگایەوە هەڵیبستێننەوە..؟؟

ئایا نازانن ئەوە ڕێگەیەکی کوفریە و داخراوە... چونکە ئەگەر سەرکەوتوش بوو – بەمشتومڕ وامان دانا– ئەوە هەرگیز ئەمە نابێتە حوکم و بڕیاری خوا، بەڵکو ئەوە حوکم و بڕیاری دەستوورە وە حوکم و بڕیاری گەلە وە حوکم و بڕیاری زۆرینەیە.. وە نابێتە حوکم و بڕیاری خوا مەگەر ئەوکات نەبێ کە ملکەچ بوون بێت بۆ فەرمایشتی خواو دڵکرانەوە بێت بۆ بەرنامەکەی و وە بەندایەتی بێت بۆی.. بەلام ئەو کاتەی ملکەچ بوون بێت بۆ ئایینی دیموکراسی و بۆ شەرع و یاسای دەستوورو حوکم و بڕیاری گەل و زۆرینە.. ئەوە بریتیە لە حوکم و بڕیاری طاغوت ئەگەر لەو کاتیشدا لەچەند شتێك و چەند شتێکدا گونجاو و شیاو بێت لەگەڵ حوکم و بڕیاری خوا، جا خوا –باسکردن و ناوهێنانی هەردەم بەرز شکۆدار بێت– فەرمویەتی:" **إنِ الحكمُ إلا لله"**[114] [واته: بێگومان حوکم و بڕیار تەنها بۆ خوایە]. وە نەی فەرموو:" **إنِ الحكم إلا للنَّاس"** [واته: بێگومان حوکم و بڕیار تەنها بۆ خەڵکە] وە فەرموی:" **وأنِ احكم بينهم بما أنز ل الله"**[115] [واته: وە حوکم بکە لە نێوانیاندا بەوەی کە خوا ناردویەتیە خوارەوە]. وە نەیفەرمووە:" **بمثل ما أنزل الله "** [واته: بە

---

(113) سورەتی (النساء) ئایەتی ٦٠.

(114) سورەتی (یوسف) ئایەتی ٤٠.

(115) سورەتی (المائدة) ئایەتی ٤٩.

**هاوشێوەی ئەوەی خوا دایبەزاندووە] یان :" وأنِ احكم بينهم بما نص عليه الدستور والقانون " [واتە: وە حوكم بكە لە نێوانیاندا بەوەی دەستوور و قانوونەكە گوتویەتی]... بگرە ئەمە قسەی موشریكەكانە لە بەندەكانی دیموكراسی و دەستوورە زەمینیەكان..**

**دواتر ئێوە لەكوێن؟ ئایا ئێوە بەردەوامن لە سڕبوونەكەتان و لە گومڕاییە كۆنەكەتان؟ ئایا سەری خۆتان لە نێو خۆڵدا دەشارنەوە.. ئایا تاقیكردنەوەی هاوشێوەكانتان لە دەورووبەری خۆتان نابینن؟؟ ئەوە جەزائیر ئەمەشیان كوێت وە لێرەش میصر وە هی ترو هی تریش.. ئایا هێشتا دڵنیا نەبوون و نەگەیشتونەتە یەقین كە ئەوە گەمەیەكی كوفریە، وە سەماگەیەكی شیركی خواری ڕێگا داخراوە؟؟ هێشتا ساغتان نەكردەوە كە بەڕاستی ئەو ئەنجومەنانە گەمەیەكە بە دەستی طاغوتەوە كەی بیەوێ دەیكاتەوە، وە چۆن بیەوێ دایدەخات، وە كاتێ دەیەوێ هەڵی دەوەشێنێتەوە[116]، بێگومان نا، هەرگیز هیچ قانونێكی تێدا دانانرێ، تاوەكو طاغوتەكە پشتڕاستی دەكاتەوەو بڕیاری لەسەر دەكات[117]. جا بۆچی**

---

[116] ماددەی ٣٤ لە دەستووری ئوردنی لقی ٢ :( پاشا بانگی ئەنجوومەنی گەل دەكات بۆ كۆبوونەوە، وە دەیكاتەوە،وە دوای دەخات وە سەرپشكی دەكات بەگوێرەی دەستوور) وە لقی ٣ :( بۆ پاشا هەیە كە ئەنجومەنی نوێنەران هەڵبوەشێنێتەوە)

[117] ماددەی ٧٩ لە دەستووری كوێتی :( هیچ قانونێك دەرناچێ مەگەر ئەنجومەنی گەل دانی پێدا بنیێت و ئەمیریش پشتڕاستی بكات (تصديقی بكات)).

وە ماددەی ٩٣ لە دەستووری ئوردنی، لقی١ :( هەر پڕۆژەیەك ئەنجوومەنی پیاوماقوڵان و ئەندامەكان دانی پێدا بنێن ئەوە بۆ پاشا بەرزدەكرێتەوە بۆ ئەوەی پشتڕاستی بكات) وە لقی٣:( ئەگەر پاشا پشت ڕاست كردنی قانونێكی نەبینی، ئەوە بۆی هەیە لە ماوەی شەش مانگ لە بەرواری بەرزكردنەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەنجوومەن)

[ وە ماددەی ١٣٨ لقی پێنجەم لە ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی عێراق:( أ: ئەو یاساو بڕیارانەی ئەنجومەنی نوێنەران دەیاندات ڕەوانەی ئەنجومەنی سەرۆكایەتی دەكرێت بە مەبەستی ڕەزامەندی دەربڕین لەسەریان بە كۆی دەنگ... ب: ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆكایەتی ڕەزامەندی نیشان نەدا، یاساو بڕیارەكان دەگەڕێنەوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران بۆ دووبارە چاوپیاخشاندنەوەیان...ج: ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆكایەتی ڕازی نەبوو لەسەر بڕیارو یاساكان بۆ جاری دووەم لە ماوەی دە ڕۆژدا لە بەرواری گەیشتنیان، جارێكی تر دەگەڕێندرێنەوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران، لەم كاتەدا ئەنجومەنی نویچنەران مافی ئەوەی هەیە بە زۆرینەی (٣/٥)ی دەنگی ئەندامەكانی بڕیاری لێبدات، كە ئیتر ناتوانرێ ناڕەزایی لەسەر دەرببردرێت و بەپەسندكراو دادەنرێت)، وە هەروەها ماددەی ٦٥ لە پڕۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان–عێراق:( سەرۆكی هەرێم سەرەڕای هەر دەسەڵاتێك

سوورن لەسەر ئەو کوفرە ڕوون و ئاشکرایە.. وە لەسەر ئەو زەلیلی و ژێردەستیە ڕوون و بێ خەوشە..؟؟

ئینجا لەگەڵ ئەمەشدا دەیانبینی ژاوەژاو و قاووقیژو هاوار دەکەن وە دەڵێن: چۆن ئەو ئەنجومەنانە بۆ شیوعی و دیانەکان جێبهێڵێن... یان هی تر لە موحیدەکان..؟؟ جا دووری بۆیان، دووری... وە لەولاتر چن، لەولاتر...

خوای گەورە دەفەرموێ:" **ولا يحزنكَ الذين يُسارعون في الكفر إنَّهم لن يضروا الله شيئاً يُريد الله ألا يجعل لهم حظاً في الآخرة ولهم عذابٌ عظيمٌ**" [واتە: با دڵ غەمگینت نەکەن ئەوانەی پێشبڕکێ و پەلە دەکەن لە بێ بڕوایدا، بێگومان ئەوانە هەرگیز هیچ زیانێك ناگەیەنن بە خوا، خوا دەیەوێت کە هیچ بەشێکیان بۆ دانەنێ لە ڕۆژی دواییدا، وە بۆ ئەوان سزایەکی گەورە هەیە].

جا ئەگەر ئێوە لە کۆمەڵەی موحیدەکانن، ئەوە ئەو بەش و بەشداریەتان پیرۆز بێت.. ئەگەر دەتانەوێ بەشداریان بکەن بە کوفرو شیرکەکانیان، بەڵام باش بزانن کە بەشداری کردن لەو بارەدا لە سنووری دونیادا ناوەستێ.. بەڵکو وەك خوای گەورە لە سورەتی (نساء)دا دەفەرموێ، دوای ئەوەی ئاگاداری دەدات لە هاوشێوەی ئەو ئەنجومەنانەدا، وە فەرمان دەکات بە جیابوونەوەیان و دانەنیشتن لەگەڵیان، ئەگەر نا دانیشتوو وەك ئەوانە، جا خوای گەورە وەك ئاگاداریکردن دەفەرموێ:" **إنَّ الله جامعُ المنافقين والكافرين في جهنَّم جميعاً**"[119] [واتە: بەڕاستی خوا کۆکەرەوەی دووڕووەکان و بێ باوەڕەکانیشە بە تێکڕایی لە دۆزەخدا]. ئایا هێشتا پاش هەموو ئەو شتانە دڵنیا نەبوون و

---

کە بە یاسا پێی بدرێ ئەم دەسەلاتانەی خوارەوەش پیادەدەکات: ... دووەم: دەرکردنی ئەو بڕیارانەی کە پەرلەمانی کوردستان دایاندەنێ، لە ماوەی پازدە ڕۆژ لە وەرگرتنیانەوە، بۆشی هەیە لەو ماوەیەدا ناڕەزایی لەسەر هەموویان یان بەشێکیان دەربڕێ و بیان نێرێتەوە بۆ پەرلەمان بۆ چاو پێداخشاندنەوەیان، و دواتر بڕیاری پەرلەمان لە بارەیانەوە بنبڕ دەبێ...))]

سەرنج بدە لە ئوردندا پێش پشت ڕاستکردنەوەی پاشا پشت ڕاستکردنەوەی ئەنجومەنی پیاوماقوڵان هەیە کە لە بنچینەدا پاشا دیاریان دەکات.. وە لەگەڵ گشت ئەمانەشدا ئەو گەلە لە گومڕاییەکەیان بێئاگاو چاو ئەبلەقن.

(119) سورەتی (النساء) ئایەتی ١٤٠.

یەقینتان نەهات کە ئەوە شیرکەکی دیارو بی خەوشە.. وە ئەوە کوفرەکی ڕوونە.. ئایا نەتانزانی ئەوە ئایینێکە جگە لە ئایینی خوا..؟؟ وە ئەوە ڕێبازێکە جگە لە ڕێبازی یەکتاپەرستی؟؟ جا کەواتە لەبەر چی ئەو پەلاماردانە لەسەری.. لێیگەڕێن بۆیان.. بەڵێ لێیگەڕێن و خۆتانی لێ دووربخەنەوەو وازی لێ بهێنن بۆ خاوەن ڕێبازەکەی.. وە شوێن ڕێبازی ئیبراهیم بکەون بە ڕاستی (حنیفاً) وە ئەویش لە موشریکان نەبووە... وە وەك نەوەکەی، یوسف –سەلامی خوای لێبێ–، کە لە پشتەوەی پەل و پۆکانی بەندیخانەکاندا بێ دەسەلات بوو، بلێن:" .. **إني تركتُ ملّة قومٍ لا يُؤمنون بالله وهم بالآخرة هم كافرون * واتبعت ملّة ءَاباءِى إبراهيم وإسحق ويعقوب ما كان لنا أنْ نُشرك بالله من شيءٍ ذلك فضل الله علينا وعلى النَّاس ولكنَّ أكثرالنّاس لا يشكرون**"[120] [واتە: بەڕاستی من وازمهێناوە لە ئاینی گەلێك کە بڕوایان بە خوا نەهێنا هەروەها ئەوان بێ بڕواش بوون بە ڕۆژی دوایی* وە شوێن ئایین و بەرنامەی باووباپیرانم ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب کەوتووم، ڕەواو شیاو نیە بۆمان کە هیچ شتێك بکەین بەهاوبەش و شەریك بۆ خوا، ئەمەش چاکەو بەهرەی خوایە بەسەر ئێمەوە، وە بەسەر خەڵکیشەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسی ناکەن].

ئەی گەلۆ... خۆتان دووربخەنەوە لە طاغوت و ئەنجومەنەکانی و خۆتانی لێ بەری بکەن وە کوفری پێبکەن مادام ئاوایە...

ئەمە بریتیە لە حەق و ڕاستیە ئاشکراکە... وە ڕووناکیە دیارو ڕوونکراوەکە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن...

" **ولقد بعثنا في كلِّ أمةٍ رسولاً أنِ اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت فمنهم من هَدى الله ومنهم من حقَّت عليه الضلالة**.."[121] [واتە: سوێند بە خوا لەناو هەموو گەل و میللەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی تەنها خوا بپەرستن و دوور کەونەوە لە –پەرستنی– هەر پەرستراوێکی تر، جا خوا هەندێکی لەو –ئوممەتانە– ڕێنمویی کرد، وە هەندێکیشیان –لەبەر خراپیان– گومڕایی یەخەی گرتن..].

---

[120] سورەتی (یوسف) هەردوو ئایەتی ٣٧–٣٨.

[121] سورەتی (النحل) ئایەتی ٣٦.

**" ءأربابٌ متفرقون خيرٌ  أمِ الله الواحد القهار * ما تعبدون من دونه إلا أسماءً سميتموها أنتم وءاباؤكم ما أنزل الله بها من سلطان إنِ الحكمُ إلالله أمر ألا تعبدوا إلا إياه ذلك الدين القيِّم ولكن أكثر النّاس لا يعلمون"**[١٢٢] [واتە: ئایا چەند خوایەکی جیا جیا باشترن یان خوایەکی تاکی بەدەسەڵات؟ ئێوە بێجگە لە خوا لە خوا هیچ شتێك ناپەرستن جگە لە چەند ناوێك نەبێت کە ئێوەو باو باپیرانتان ناوتان ناون، خوا هیچ بەڵگەیەکی دەربارەیان نەناردۆتە خوارەوە، بێگومان بڕیار تەنها بۆ خوایە، فەرمانی داوە بێجگە لەو هیچ شتێ نەپەرستن، ئەوەیە دینی ڕاستی دامەزراوی نەگۆڕاو، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن].

خۆتانی لێ دووربخەنەوە ئەی قەومەکە، وە خۆتان بەری بکەن لە خاوەنەکەی و شیرکەکەی پێش لەدەستچوونی کاتی خۆی... وە پێش ئەوەی ڕۆژێك بێت کە ئەوە بەرزترین و گەورەترین شتێك دەبێت کە خۆزگەی بۆ دەخوازن بەڵام دوای لەدەستچوونی کاتەکەی، وە ئەو ڕۆژ هەرگیز نە پەشیمانی سوودی بۆتان دەبێت وەنە هەناسە هەڵکێشان یان حەسرەت و خەم و پەژارە...

**" وقال الذين اتَّبعوا لو أن لنا كرةً فنتبرأ منهم كما تبرءوا منا كذلك يُريهمُ الله أعمالهم حسـرات عليهم وما هم بخارجـين من النّار"**[١٢٣] [واتە: ئەوانەی کە دوایان کەوتبوون ووتیان: خۆزگە ئێمە بگەڕاینەتەوە –بۆ دونیا– تا خۆمانمان لێ بەری بکردنایە هەروەك ئەوان خۆیان لێمان بەری کرد، ئاوا خوا کردەەکانیان نیشان دەدات بە داخ لەسەر دڵیان، وە ئەوان دەرچوونیان نیە لە ئاگر –دۆزەخ–].

ئێستا وازی لێبێنن، وە بڵێنە خاوەنەکانیان – ئەگەر ئێوە لەسەر ڕێبازی ئیبراهیم و ڕێگای پەیام گەیەنەرەکان (نبـي) و پێغەمبەرانن (رسول)– هەروەك ئێمە لە کۆتایی قسەکانمان دەڵێین:–

ئەی بەندەکانی قانوونە دانراوو دەستوورە زەمینیەکان...

ئەی خاوەنی ئایینی دیموکراسی...

---

[١٢٢] سورەتی (یوسف) هەردوو ئایەتی ٣٩–٤٠.

[١٢٣] سورەتی (البقرة) ئایەتی ١٦٧.

وە ئەی پەروەردگارە یاسا دانەرەکان...

ئێمە خۆمان بەری دەکەین لە ئێوەو لە ڕێبازەکەتان بۆ –نزیك بوونەوەمان– لە خوا...

کوفرمان بە ئێوەو بە دەستووورە شیرکیەکەتان و بە ئەنجومەنە بت پەرستیەکەتان کرد...

وە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی بۆ هەمیشە دەرکەوت و دەستی پێ کرد تاوەکو باوەڕ تەنها بە خوا دەهێنن...

# چەند ڕووداو دیمەنێکی پەرلەمان جا پەند وەربگرن ئەی خاوەن ژیری و بینینەکان[٩٩]

( وا گومـانم نـەدەبرد ئـەوی کـە خـوا لـە پەرتووکەکەیداو لەسـەر زوبـانی پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیاری لەسەر داوە پێویستی بە پەسـندکردن و قایـل بـوونی بەنـدەکانی خوا هەبێت، بەڵام کتوپڕ بەسەرما هات کـە فەرمایشـتی پـەروەردگاری بـەرز بـەردەوام لـە پەڕاودا (مصحف) دەمێنێتەوە – پیرۆزیەکەی هەیە لە دڵماندا– تاوەکو بەنـدەکانی خـوا لـە پەرلەمان  قایل دەبن لەسەر دانانی فەرمایشتی خوا بە قانوون. وە ئەگەر بڕیـاری بەنـدەکانی خوا لە پەرلەمان جیاواز بوو لەسەر حـوکم و بڕیـارێکی خـوا لـە قورئانـدا، ئـەوە بڕیـاری بەنـدەکانی خـوا دەبێتـە قـانوونێکی کـارپێکراو لـە دەسـەڵاتی دادوەری و جێبـەجێکردنی دەسـتەبەرکراوو زامنکـراوە لەلایـەن دەسـەڵاتی جێبەجێکردنـەوە، جـا ئەگـەر موعـاریزو پێچەوانەیش بێت بۆ قورئان و فەرموودە. بەڵگەش لەسەر ئەمە خوا ئارەقی قەدەغە کردووە، وە پەرلەمانیش ڕێی پێداوە، وە خوا فەرمانی کردووە بە جێبـەجێکردنی سـزاکان (حَـدْ)، وە پەرلەمانیش بەفیڕۆی داوە، دەرەنجامیش لە سێبەری ئەم نموونانەدا ئەوەیە کە بێگومان ئـەوەی پەرلەمان بڕیاری لەسەر داوە بووەتە قانوون سەرەڕای پێچەوانە بوونیشی بۆ ئیسلام).

ئەم وتانـە بـریتین لـە کورتـەی ئـەو شـتانەی کـە یـەکێك لـە زاناکـانی ئیسـلام پێیگەیشتوە دوای ئەوەی هەشت ساڵی وەك ئەندام لە پەرلەمان بەسەر بـردووە. ئـەو نائیبـە زانایە هەستی کرد بە گرنگی وتاربێژی لەسـەر مینبـەرەکان، وە نوسـین لـە ڕۆژنامەکانـدا، دوای ژیانێکی درێژ لەگەڵ ئەو شێوازانەدا، باوەڕی بە سوودو فائیدەکانی زیـاتر بـوو بـەڵام هەستی کرد ئەو بە تەنها گۆڕانێکی لە قانوونوکاندا پێ ناکرێ، وە کاریگەریەکی بەردەوامی

---

[٩٩] وتارێکی دکتۆر ئەحمەد ئیبراهیم خضرە لە ژمارەی شەست و شـەش لـە گۆڤـاری (بـەیان) بڵاوکرایـەوە کـە لـە یانەی ئیسلامی –المنتدى الإسلامي– لە لەندەن دەردەچێت.

نابێت لەسەر دەسەڵاتەکانی یاسادانان و دادوەری و جێبەجێکردن، بۆیە خۆی پاڵاوت بۆ ئەندمێتی پەرلەمان وەك بەدواگەڕانێك بەدوای شێوازێکی نویٚ بۆ بەرزکردنەوەی فەرموودەی خوای گەورە بۆ جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی، وەك ڕزگاریەك بۆ بەندەکان لە گومڕایی و ئازادکرن و ڕزگارکردنیان لە نارەوایی و پوچەڵیەکانیان و پاڵنانیان بۆ گۆڕەپان و مەیدانی ئیسلام.

زاناکە بۆ ئەندام پەرلەمانێتی سەرکەوت لەژێر دروشمی ( دەنگی خۆتم پیٚ بدە بۆ ئەوەی دونیا چاك بکەین بە ئایین)، وە خەڵك لەبەر متمانەییان پێی دەنگی خۆیان پێدا، سەرەڕای گشت هۆکارەکانی ساختەیی و تەزویر لە هەڵبژاردنەکاندا. جا ئەندامەکە دوو خول لەدوای یەك بەردەوام بوو لە ئەندام پەرلەمانیەتی، پاشان وتی:( بەڕاستی ئەو لای سەخت و گران بوو وە پێی ناخۆش بوو کە ڕاگەیاندنی ئیسلامی دەنگدانەوەی ژیری و مەنتیقی ئەو بدۆزێتەوە لەو دوو خولەدا).

ڕۆژێك نائیبە زاناکە بۆ یەکێك لە فەرمانگەکانی ئاسایشەوە چوو بۆ جێبەجێکردن و ڕاپەڕاندنی بەرژەوەندیەکانی هاولاتیانی، لە نوسینگەی ئاداب تووشی نزیکەی سی (٣٠) ئافرەت بوو کە لەسەر کاشی دانیشتبوون، پرسیاری کردو وتی: تاوانی ئەمانە چین؟ بەرپرسەکە وتی: ئەوانە بیٚ ئابڕو و بەدڕەوشتن! ئەویش وتی: ئەی پیاوە بەدڕەوشتەکان لەکوێن؟ ئەمە تاوانێکە ناکریٚ مەگەر لە نێوان پیاوێکی زیناکەرو ئافرەتێکی داوێن پیس نەبیٚ. بەرپرسەکەش پێی ڕاگەیاند کە پیاوی زیناکەر لای ئەوان تەنها شایەتە کە زینای لەگەڵ ئەو ئافرەتانە کردووە وە لەسەری پاداشتی داوەتیٚ، بۆیە ئەو ئافرەتە مەحکەمە دەکریٚ نە لەبەر ئەوەی زینای کردووە بەڵکو لەبەر ئەوەی پاداشت و ئەجری وەرگرتووە. جا ئەو پیاوەی دانی بەوەدا نابوو و ئیعتیرافی کردبوو لەوەی زینای کردووە گۆڕا بە شایەت لەسەر ئافرەتەکە، وە قانوونیش ئاوڕناداتەوە بۆ دانپێدانانەکەی و ئیعتیرافەکەی بە زیناکردن.

جا نائیبە زاناکە توڕە بوو، توڕەییەك بۆ خوا، بەرپرسەکەش بە سانایی پێی وت:( ئێمە قانونێك جێبەجیٚ دەکەین کە ئێوە لە پەرلەمان دانتان پیٚ داناوە).

ئەندامە زاناکە بۆی دەرکەوت بێگومان هەرچەندە جەماوەری بانگکارانی جێبەجێکردنی شەریعەت زۆر بێت، وە هەرچەندە پەرتووکی خواو فەرمایشتی پێغەمبەرەکەی

ﷺ پشتگیری بکەن ئەوە ئومێدو هیوای جێبەجێکردنی شەریعەت ناکرێ بێتە دی مەگەر لە ڕێگای پەرلەمان نەبێ کە ناوی دەنێن ( دەسەڵاتی یاسادانان)، وە لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی دادوەری حوکم ناکات مەگەر بەو قانونانە نەبێت کە لە پەرلەمان دەردەچێت، وە دەسەڵاتی جێبەجێکردنیش نە بۆ پاراستنی قورئان و فەرموودە دەجولێت، وە نە بۆ پاراستنی ئیسلام مەگەر بە ئەندازەی ئەوە نەبێ کە پەرلەمان دانی پێدا ناوە لەو لایەنە پیرۆزانە، ئەندامە زاناکە بیروباوەڕی وابوو گەیشتن بۆ ئەو مەبەستە دەکرێ ئەگەر ئەندام پەرلەمانەکان زانیان ئەوە فەرمایشتی خوایە، وە فەرمایشتی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، وە حوکم و بڕیاری ئیسلامە بۆ ئەوەی دانی پێدابنێن.

ئەندامە زاناکە بۆی دەرچوو و پڕۆژە قانونێکی پێشکەش کرد بۆ جێبەجێکردنی سزا شەرعیەکان، وە پڕۆژە قانونێك بۆ قەدەغەکردنی سوو ( ڕیبا) لەگەڵ پێشنیارکردنی چارەسەری تر لە جیاتی ئەو، وە پڕۆژە قانونێك بۆ سەرشۆڕکردنی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بۆ بڕیارەکانی خوا، وە پڕۆژە قانونێك بۆ چاودێری پیرۆزی مانگی ڕەمەزان و بە ئاشکرا ڕۆژوو نەشکاندن لە ڕۆژەکەیدا، وە پڕۆژە قانونێك بۆ پاککردنەوەی کەنارەکان لە بەدڕەوشتی، وە زۆرێك لە پڕۆژەی تری ئیسلامی. وە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندام پەرلەمانان لەگەڵ ئەو واژوویان لەسەر پڕۆژەی ئەو قانونانە کرد. جا ئەندامە زاناکە چوو بۆ بەجێهێنانی عومرە، وە هەندێك لە ئەندام پەرلەمانەکان هاوڕێیەتیان کرد، وە لای بەردە ڕەشەکە (حجر الأسود) گشتیان پەیمانیان بەخوا دا بۆ سەرخستنی شەریعەتی خوا لە پەرلەمان، دواتر سواری فڕۆکە بوون بەرەو مەدینەی مونەوەرە، ئینجا لە گۆڕەپانی مزگەوتی پێغەمبەر پیمانیاندا لەسەر بەرزکردنەوەی دەنگیان بۆ سەرخستنی شەرعی خوا نەك بۆ سەرخستنی پەیوەندی حیزبیان.

ئەندامە زاناکە بەرپرسیاریەتی دانپێدانانی بە حەرامەکان و سەرپێچی کردنی شەریعەتی خستە ئەستۆی سێ دەسەڵاتەکە لە دەوڵەتدا، وە پەیمانی بە وەزیری دادی ئەو کات دا دوای چەند مانگێك لێپرسینەوەی (إستجواب) بکات ئەگەر ئەو قانونانەی جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی تەواو بووە پێشی نەخات. وەزیریش ئەو شتانەی ئەندامەکە پێشکەشی کردبوو بۆی پێش نەخست، ئەوە بوو ئەندامەکە لێپرسینەوەی خستەوە ڕوو –

لێپرسینەوەش (إستجواب) لە نەریتی پەرلەمانات لەسەر پرسیار ئاراستەکراو پەیوەست دەکات کە وەڵامی بداتەوە تا ئەو کاتەی ئەندامیەتی وەزیر نەکەوتبێ یان وەزیرە پرسیار لێ کراوەکە لە وەزارەت دەردەکرێت- ئەندامەکەش سووربوو لەسەر لێپرسینەوەی وەزیرەکە، وە حکومەتیش پشتگیری لە وەزیرەکەی کرد، وە سووربوو لەسەر ڕماندن و داخستنی پرسیارلێکردن، پاش ئەوەی سووربوونی ئەندامەکە توندبوو لەسەر لێپرسینەوە، حکومەت گۆڕانکاریەکی لەئاستی وەزارەتەکاندا کرد بەجۆرێك کەسی لێ دەرنەچوو جگە لە وەزیری داد نەبێ، واتە وەزیر لە وەزارەت دەرکرا بۆ لێخستنی لێپرسینەوە، ئەم کارە چەندجارە بوویەوە تاوەکو بووبە ڕێسایەك لە ڕێساکانی هەڵسوکەوت کردن لە پەرلەماندا.

نائیبە زاناکە جاری دووەم پەنای بردە بەر ئەندام پەرلەمانەکان و پێی وتن: پڕۆژەی قانوونە ئیسلامیەکان لە پلیکانی لێژنەکان دانراوە، وە پەیمانیشتان داوە بە خوا لە دوو حەرەمەکە لەسەر ئەوەی دەنگتان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی بێت، وە دوای واژووی لێکردن بۆ داواکاری یەکسەر جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی، ئەوانیش وەڵامیاندایەوە، وە واژوویان لەسەر ئەوە کرد کە داوای لێکردبوون، ئەوەبوو نائیبە زاناکە ئەو وەسیقەی لە سپاردەی پەرلەمان دانا، وە بە ناوی گشت ئەندامەکانەوە داوای چاوخشاندنی کرد بە قانونەکانی شەرعی خوا، جا سەرۆکی پەرلەمان هەڵساو بە ناوی گشت ئەندامەکانەوە داوای چاوخشاندنی کرد بۆ قانونەکانی شەرعی خوا، وە بە ئەندامەکانی وت: حکومەت حەماسەتی لە ئێوە کەمتر نیە بۆ ئیسلام، بەڵام ئێمە داوای مۆڵەتێکتان لێدەکەین بۆ گونجان و ڕێکەوتنێکی سیاسی، جا ئەو ئەندامانەی واژوویان کردبوو چەپڵەیان بۆ لێدا، ئەوانەی پەیمانیان لە دوو حەرەمەکە دابوو لەسەر کارکردن بۆ جێبەجێکردنی شەریعەتی خوا، وە ڕێك کەوتن لەسەر داواکەی، پاشان داواکاری بە جێبەجێکردنی فەوری بۆ شەریعەت بە فیڕۆچوو و حکومەت سەرکەوت.

نائومێدی بەسەر نائیبە زاناکە زاڵ بوو لەبەر بێ سوودی و بێ فایدەیی هەوڵەکانی لە پێناو جێبەجێکردنی شەریعەت لەگەڵ ئەندامانێك کە بانگیان دەکات و وەڵامی دەدەنەوەو دواتریش وازدەهێنن، پاشان ڕۆژێکیان لەناکاو تووشی پێشنیارێك بوو لە سەرۆکی پەرلەمانەوە بۆ قایل بوون لەسەر پێکهێنانی لێژنەیەکی گشتی بۆ بە قانوونکردنی شەریعەتی

ئیسلامی، وە ڕاستیەتی ئەو کارە ڕوون بوویەوە جا بینی ئەو بڕیارە کتوپڕەی حکومەت هیچ نیە تەنها بۆ داپۆشینی ڕیسواییەکی گەورەیە کە پەیوەندی بە ئابرو و کەرامەتی ولاتەوە هەیە. وە حکومەت بڕیارێکی لە بەرژەوەندی ئیسلام نەدا. وە ئەندامەکە پێشوازی لە بیرۆکەکە کرد سەرەڕای تێگەیشتنیشی بۆ دووریەکانی، وە لیژنەکە کۆبوویەوە بەلام ئەندامە زاناکە هەستیکرد بەوەی دەولەت جددی نیە لە جێبەجێکردنی شەرعی خوا چونکە ئەگەر بیەوێت خوا ڕازی بکات ئەوە چەندین کار هەن پێویستی بە لێکۆلینەوە نیە. داخستنی کارگەکانی ئارەق بە پێداهێنانی قەلەمێك دەکرێ. وە داخستنی بارو مەیخانەکانیش بە پێداهێنانی قەلەمێك دەکرێ.

لەوێدا هەندێك دیاردەو ڕوالەت هەبوون لە قولاییدا بەلگەبوون لەسەر ڕاستیەك، گشتیان یارمەتیدەر بوون بۆ ئەوەی لە دەروونی ئەندامە زاناکە هەستێك جێبهێلن – لە خوودی خۆیدا ڕێسایەك دادەڕێژێت لە ڕێساکانی هەلسوکەوتکردن لەگەل پەرلەمانەکاندا– بەرەنجامەکەی: شەرعی خوا بەهیچ جۆرێك لەسەر دەستی ئەوانە ناچەسپێ.

خەلکی تووشی لەناکاویەك بوون وە هەروەها نائیبە زاناکەش تووشی لەناکاویەك بوو بە هەلوەشانەوە پەرلەمان دوای ئەوەی خۆی سەرۆکی لیژنەی بەرگری کردن لە جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی بوو، وە لەگەل لیژنەکە بەردەوام بوو لە سەپەرشتی کردنی کاری توێژینەوەو قانون دەرکردن لە ڕێگای سی (٣٠) کۆبوونەوە. وە لە –کاتی– نەبوونی پەرلەماندا بڕیارێکی ترسناك دەرچوو لە بوارێك کە پەیوەندی هەبوو بە ژیانی تاکی خەلکەوە. جا ئەندامە زاناکە دژی ئەو بڕیارە وەستا چونکە پێچەوانە بوو بۆ ئیسلام و دەستوور، بەلام ڕێساکە دەلێ: **بێگومان دەکرێ گشت پەرلەمان بە بڕیارێك هەلبوەشێتەوە ئەگەر دەولەت بیەوێت فەرمانێك لەسەر خەلك بسەپێنێ جا ئەگەر پێچەوانەی ئیسلامیش بێت.**

بەلام گرنگترین ڕێسایەك کە پەرلەمان پشتی پێ دەبەستێ، ئەوە ئەندامە زاناکە کورتی کردۆتەوە بە وتەکەی:

**( هەرچەندی بەلگەم پێ درابێت، وە هەرچەندە بۆچوونەکانم پشتی بەستبێ بە قورئان و فەرموودە، ئەوە لە عەیب و کەموکوڕیەکانی پەرلەمان و بەرپرسیاریەتە قورس و**

**گرانەکەیدا ئەوەیە کە بەڕاستی دیموکراسی بڕیار دەکاتە هی زۆرینەی ڕەها، بە ڕەهایی بەبێ قەیدو بەبێ مەرج ئەگەر پێچەوانەی ئیسلامیش بێت).**

ئەندامە زاناکە هەستی کرد لەشکرێك لە تەسککردنەوە لەسەری بەهێزتر دەبێت لە لایەن حکومەتەوە، وە لە لایەن سەرۆکی پەرلەمانەوە-، وە لە لایەن حیزبی زۆرینەوە براوەوە، وە سەرۆکایەتی پەرلەمان چەند شۆڕشێکی لەدژی بەرپاکرد، وە تۆمەتباری کرد بەوەی کە ئەو کارەکانی لیژنەکان ڕادەگرێ. بەڵام ئەو بەردەوام بوو لە بەخشینی تواناکانی. ئەوەبوو ژمارەیەك پرسیاری پێشکەش کرد کە لە خشتەی کارەکاندا دانەنرابوو، وە هەڵسا بە ژمارەیەك داواکاری ناردراو، بەڵام بینی کە داپۆشراوەو هیچ کەسێك بۆی هەڵنەساو نەکرا، پاشان گەڕایەوە بۆ بەکارهێنانی چەکی پرسیارلێکردن کە ڕەتکردنەوەی نیە. جا وەزیرەکانی حکومەتی لێپرسیەوە لە پشت کردنی دەوڵەت لە دادوەری شەرعی و ئەوقاف، وە پەیمانگا ئایینیەکان، وە شوێنەکانی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، وە فەرامۆش کردنی بەرنامەکانی خوێندن لە زانکۆ ئایینیەکان بە بەڵگەی پێشخستنیان، وە پشتگوێ خستنی مزگەوتەکان بە دەرکردنی بڕیارێك کە ڕێ بە کەس نادات کە بچێتە شوێنەکانی پەرستن ئەگەر لە (کەڵەزاناکان)یش بێت، وە قسەیەك بکات جا ئەگەر وەك ئامۆژگاریەکی ئایینیش بێت، قسەیەك پێچەوانەی بڕیارێکی کارگێڕی یان قانونێکی چەسپاو بێت، وە ئەوەی وا بکات بەند دەکرێت و غەرامە دەکرێ، وە ئەگەر بەرەنگاریش بکات ئەوە غەرامەکەو ماوەی بەند کردنەکە چەند جارە دەبێتەوە.

ئەندامە زاناکە لێپرسینەوەکەی پێشکەش بە وەزیری گەشت و گوزار کرد، چونکە چەند قوتابیەك لە قوتابخانەکانی شێوە هوتێلەکان ناچارکرابوون لەسەر تامکردنی ئارەق ئەوانیش قەبولیان نەکردو لە خوێندن دەرکران و لابران، وە لێپرسینەوەیەکی تری پێشکەشی وەزیری ڕاگەیاندن کرد بە مەبەستی پاککردنەوەی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن لە ڕابواردن و بەدڕەوشتی کە بەهاو ڕەوشت و پیرۆزیەکانی وڵات لەناو دەبات و تەفروتونای دەکات، وە لێپرسینەوەی سێیەمیش بۆ وەزیری گواستنەوەو گەیاندن لەسەر وێنەی کەمی و کەمتەرخەمیەکانی ئەو ناوەندانە، ئیدی ئەندامە زاناکە هەستی کرد کە لێپرسینەوە دوای لێپرسنەوە پێشکەشی زێرابەکان دەکات، بۆیە لە پەرلەمان وەستاو موحاسەبەی

سەرۆکەکەی دەکرد و تۆمەتباری دەکرد بە دەرچوون لە بەرنامەی پەرلەمان، سەرۆکی پەرلەمانیش لە گەمەیەکی سەرنج ڕاکێشدا فەرمانی کرد بە تێخستن و تۆمارکردنی هەرسێ لێپرسینەوەکە –لە خشتەی کارەکانی پەرلەمان– لە یەك دانیشتندا، لەگەڵ ئەوەی هەر لێپرسینەوەیەك پێویستی بە چەند ڕۆژێك هەیە، دواتر بانگی دەستەی پەرلەمانی حیزبی زۆرینەو براوە کرد بۆ تێکدانی و ئەو لێپرسینەوانە، بانگی وەزیری گەشت و گوزار کرا، حکومەت کە بەرهەڵستی کرد لەسەر تۆمارکردنی ئەو لێپرسینەوانە بۆ خشتەی کارەکان خۆی خستەناویەوەو خۆی تێهەڵقورتاند، چونکە وشەیەکی نابیەی تێدابوو کە بەتەواوی بریتیبوو لە ( تۆمەتبارکردنی وەزیر لە لایەن خاوەن لێپرسینەوە بەوەی ڕاستیەکانی وشك کردۆتەوە لە میانەی وەڵامەکانی بۆ پرسیارەکان)، دواتر باسەکە بۆ ئەندام پەرلەمانەکان پێشکەشکرا، ئەوانیش بڕیاریاندا لێپرسینەوەکە ڕابگرن، وە ئەوەیان پەکخست کە ناو دەنرێ بە مافی دەستووری بۆ ئەندام لە موحاسەبەکردن و لێپرسینەوەی دەولەت، دواتر بانگ بۆ لێپرسینەوەی پێشکەشکراوی دووەم بۆ وەزیری ڕاگەیاندن کرا، جا هەروەك چۆن ئەندامەکان بۆ ئارەق سەرکەوتن، ئاواش بۆ سەما سەرکەوتن سەرەڕای ئەوەی ئەوان پەیمانیان بەخوا دابوو بۆ سەرخستنی شەریعەتەکەی، دواتر بانگی وەزیری گواستنەوە کرا، بەڵام ئەندامەکان وایان بینی کە موحاسەبەو لێکۆڵینەوەی وەزیر لەگەڵ ئارەزووەکانیان یەکدەگرێتەوە، بۆیە ئەندامە زاناکە هەڵسا بۆ تەختی قسەکردن و بە ئەندام پەرلەمانەکانی وت:–

( ئەی ئەندامە بەڕێزە ئامادە بووەکان من پلەو پایە پەرست نەبووم، وە سوور نەبووم لەسەر کورسی بۆ خوودی کورسی، دروشمی من لەگەڵ ئەوانەی لە یەك بازنە بووین ( دەنگی خۆتم پێ بدە بۆ چاککردنی دونیاو ئایین) **وە ئەوکات من گومانم وابوو بۆ گەیشتن بەو مەبەستە بەسە کە پڕۆژەی قانوونەکانی ئیسلام پێشکەش بکرێت، بەڵام بۆم ڕوون بوویەوە ئەو ئەنجوومەنەمان بۆ خوا حوکمێك نابینێ مەگەر لە ڕێگای ئارەزووەکانی حیزبەوە نەبێت، وە زۆر دوورە کە ڕێ بدات بەوەی وشەی خوا بەرز بێت..**

**بەڕاستی لە نێو ئێوەدا ڕێگای خۆمم بۆ ئەو مەبەستە بەداخراوەیی دۆزیەوە، بۆیە دەست لەکار کێشانەوەی خۆم لە پەرلەمان ڕادەگەیەنم بەبێ پەشیمانی لەسەر ئەندامیەتیەکەی).**

وە ئەندامە زاناکە چوو بۆ ماڵەکەی خۆی لە ئەپڕیلی (مانگی چوار) ١٩٨١ وە دانیشتنەکەش کۆتایی پێهێنرا.

ئەندامە زاناکە پەرلەمانی جێهێشت، دواتر گشت ئەو دونیایەشی جێهێشت، دواتر پاش چەند ساڵێك، وە پەرلەمانیش مایەوە دادوەری دەکرد و شەرعی دادەنا و جێبەجێی دەکرد بە جگە لەوەی خوا دایبەزاندووە.

# ناوەڕۆك

بێگومان دیموکراسی ئایینێکە جگە لە ئایینی خوا وە ڕێبازێکە جگە لە ڕێبازی یەکتاپەرستی، وە ئەنجومەنەکانی نوێنەرانیش شتێك نیە تەنها کۆشك و تەلارن بۆ شیرك و هاوبەشی دانان، وە قەڵان بۆ بتپەرسی کە خۆلێ دوورخستنەوەیان پێویست و واجبە بۆ جێبەجێکردن و تەواوکردنی یەکتاپەرستی، کەوا مافی خوای گەورەیە لەسەر بەندەکان، بەڵکو هەوڵدان بۆ ڕماندنی و دژایەتی کردنی پشتیوانەکانی و رق لێبونەوەیان و جیهاد کردنیشیان پێویست و واجبە...ئەمەش شتێکی ئیجتیهادی نیە هەروەك لای هەندێك لە پۆشەرانی شیرینە کە وای لێبکەن –و بیخەنە ئەو بازنەیەوە–...بەڵکو ئەمە شیرکێکی ڕوون و ئاشکرایە، وە کوفرێکی دیارو بێ خەوشە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاگاداری داوە دەربارەی، وە پێغەمبەریش ﷺ بە درێژایی ژیانی شەڕی ئەمەی کردووە...

دانەر